- ناوی کتێب: نەورۆزی کوردستان لە ئەفسانەوە بۆ مێژوو.

- نوسەر: پ.د. زرار صدیق تۆفیق.

- چاپ: چاپخانەی زانکۆی صەلاحەدین_ هەولێر.

- شوێن و ساڵی چاپ: هەولێر _ ۲۰۱۷.

- تیراژ: ٥٠٠ دانە.

- ژمارەی سپاردن: ژمارە (D-/2044/17)ی بۆ تەرخانکراوە لە پەرتوکخانەی بەدرخانیان: دهۆك.

دانایێ موعەممەرێ کوهەن سال
ئەڤ رەنگەهە گۆ ژ بۆ مە ئەحوال
کو عادەتێ پێشییێ زەمانان
ئەڤ بوو ل هەمی جە و مەکانان
وەقتێ وەکوو شەهسوارێ خاوەر
تەحویل دکر د ماهێ ئازەر
یەعنێ کو دهاتە بورجێ سەرسال
قەط کەس نەدما دمەسکەن و مال
(بالجملة) دەچوونە دەر ژ مالان
حەتتا دگەهیشتە پیر و کالان
رۆژا کو دبوویە عیدێ نەوروز
تەعظیم ژ بوو دەما دل ئەفروز
صەحرا و چەمەن دکرنە مەسکەن
بەیدا و دەمەن دکرنە گوڵشەن
خاسما عەزەب و کچێ د باکر
(القصه) جەواهرێ د نادر
تێکدا د موزەییەن ومولەببەس
ڤێکڕال تەفەڕوجێ مورەخخەص
.......................          ................
دەورا فەلەکێ ژ بەختێ فەیرۆز
دیسان کو نوما ژ نووڤە نەورۆز
مەبنی ل وی عادەتێ موبارەك
شەهری و سوپاهیان ب جارەك
بازێر و کەلات و خانی بەردان
تەشبیهی ب نژدەیان و جەردان
صەف صەف دمەشینە کووە و دەشتان
رەف رەف دخشـــــینە ســــــەیرو گەشـــــتان

ئەصنافێ ئومەم صغار و کوببار
قەطعا ڤەنەدما د شەهری دەییار
هندەک ب پەیایی چوونە باغان
هندەک ب سواری چوونە راغان
هندەک ب تەبایی و ب کثرەت
هندەک ب هەڤالی و ب وەحدەت
رابوونەڤە خانم و خەواتین
وان ژی تژی گول کرن بەساتین
حووران کرە مەسکەنێ خوە جەننەت
بێ پەردە وبێ مەلال ومننەت
......................... .....................
سەوداگەرێ عیشقێ بوون د بازاڕ
هەم بائعێ حوسنێ هەم خریدار
سەرسالی و باکر و رەوالان
سەدسالی و جوان و پیر و کالان
سەرسال ل رەسم و راهێ مەعهوود
گێڕان د جه و مەقامێ مەحموود

ئەحمەدی خانی- مەم و زین

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

نەورۆز ئەفسانەیەکی هەرە دێرین و هاوبەشی گەل و نەتەوە ئێرانیەکانە و رەگی قوولی بە ناخی مێژووی مرۆڤایەتیدا رۆچووە و کاریگەرییێکی مەزن و بەردەوامی لە کەلتور و هزر و دابونەریتی ئێرانییان و میللەتانی دەرهاوسێیان و شارستانیەتی دەوروبەریان بەجێ هێشتووە، بەگوێرەی کتێبی پیرۆزی مەزدییەسنا، لەدایکبوونی زەردەشت و بوونی بە پەیامبەر و لەدایکبوونی زۆربەی شاهانی پێشدادی و سەرکەوتن و سەروەرییەکانی ئێرانزەمین بەند و پەیوەستە بە رۆژی نەورۆزەوە[1].

بەمپێیە، هەردەم بووەتە بابەتێکی بالکێش و بەپێزی نوسین و ڤەکۆلین و تا هەنووکەش هەردەم کاری لەبارەوە دەکرێت و لێکۆلینەوە و دوڤچوون لەمەڕ بنەچە و رەهەندە هەمەلایەنەکانی ئەنجام دەدرێت. لەمێژە، نوسەران و ڤەکۆلەرانی فارس[2] و دواتریش ئەوانەی عەرەب و کورد و رۆژهەلاتناسان، قەلەمیان خستۆتەگەڕ و دەیان کتێب و نامیلکە و لێکۆلینەوەیان سەبارەت بە نەورۆز بلاوکردۆتەوە و لە هەموو رەهەند و ئاست و بوارەکانی وردبوونەتەوە، وەك: رەگوڕیشەی ئەفسانەی

(١) رەزا دەشتی، نەورۆز و بۆنەکان لە گێڕانەوە مێژووییەکاندا، وەرگێڕانی رێبوار سەرتیپ زەندی، ل٣٥_٣٦.

(٢) بڕوانە: نوروز (مجموعه مقالات)، به کوشش علی دهباشی، نشر آفکار(تهران :١٣٩١هـ. ش)، ١١٣٧ لاپەڕە، هاشم رضی، جشن های آب، انتشارات بهجت (تهران:١٣٨٥هـ. ش).

نەورۆز و پەیوەندی و نزیکایەتیی بە جەژن و بۆنەکانی وڵاتی سۆمەر و ئەکەدەوە[1] و رەنگدانەوەی لە مێژوو و فەرهەنگی ئێران[2] و لە شیعر و ئەدەبیاتی فارسی[3] وعەرەبی دا[4] و نەورۆز وەك بنەمایەك بۆ ساڵنامە و رۆژژمێری[5] و خستنەرووی لێکەوتە و کاریگەریی بەسەر کۆمەڵگا عەرەبی و ئیسلامیەکاندا و سەرباری شارستانیەتی قیبتیەکانی مصر[6]، هەروەها رۆڵی لە پتەوکردنی پەیوەندی و تێکەڵیی فەرهەنگی و

(١) بگەڕێرەوە بۆ: حسين قاسم العزيز، الجذور الأسطورية لملحمة نوروز الشعبية، مطبعة دار الشؤون الثقافية العامة (بغداد:٢٠١٠)، المفصل في نشأة نوروز الذهنية الأبداعية، مؤسسة ژين (السليمانية:٢٠١٢)، عبدالكريم شاهين، عيد النوروز، الأصل التأريخي والأسطورة، دار الزمان (دمشق:٢٠٠٨).

(٢) زانستیترینیان کتێبەکەی(هاشم رضي) یە، جشن های آب.

(٣) بگەڕێرەوە بۆ: محمد معين، جشن نوروز، مجله جهان نو، سال أول، شماره أول (خرداد ١٣٢٥هـ.ش)، بڕوانە: نوروز(مجموعه مقالات)، به كوشش على دهباشى، ص٥١_٥٤، محمد أمين رشيد، النوروز في الأدب الفارسي حتى نهاية العصر الغزنوي، رسالة ماجستير، كلية الآداب (جامعة عين شمس: ١٩٧٦).

(٤) بڕوانە: د.فؤاد عبدالمعطي الصياد، النوروز وأثره في الأدب العربي (بيروت :١٩٧٢)، وصفي حسن، عيد نوروز في الشعر العربي، مطبعة الخاني (دهوك: ٢٠١٢)، هيرش محمد أمين، نوروز في الشعر العباسي، مجلة جامعة كويه، العدد(٢) (كويه: ٢٠٠٥)، ص٩٥_١١٥.

(٥) بگەڕێرەوە بۆ: عەبدولعەزیم رەزایی، مێژووی نەورۆز و کرۆنۆلۆجیای ئێران، وەرگێڕانی شەریف فەلاح، خانەی موکریانی (هەولێر:٢٠١٢).

(٦) بگەڕێرەوە بۆ: رمضان رمضان متولي، عيد النوروز عند الفرس وتأثيره في المجتمعات العربية، المجلس الأعلى للثقافة (القاهرة:٢٠١٣).

شارستانیی نێوان فارس و عەرەب بە درێژایی مێژوو[1].

هاوکات نەورۆزی کوردستانیش بووەتە جێگەی بایەخی نوسەران و لێکۆڵەرانی کورد، بەتایبەت مژاری راپەرینەکەی کاوە و سەرهەڵدانی داستان و جەژنی نەورۆز [2]، وێرای کاریگەری و رەنگدانەوەیی لە شیعر و پەخشان و ئەدەبیاتی کوردیدا [3]و دانانی بە دەستپێك و سەرەتاییێك بۆ شارستانیەتی کوردستان و جەژنێکی نەتەوایەتی کورد...هتد[4].

نوسەری واشمان هەن، کەوتوونەتەخۆ و بە خوێنگەرمیەوە داکۆکی لە ئەوە دەکەن کە کوردستان لانکەی لەدایکبوونی نەورۆزە و کورد خاوەندی یەکەمیەتی و بە داهێنانی بێخەوشی نەتەوەی کورد

---

(١) بگەڕێرەوە بۆ: كاظم عبد علي، النوروز مظهر من مظاهر التواصل بين العرب والفرس، رسالة ماجستير، الجامعة اليسوعية (بيروت:١٩٧٥)، مهدي ممتحن، النوروز مظهر الثقافة والحضارة بين الفرس والعرب، مجلة آفاق الحضارة الاسلامية، العدد (١) ،السنة(١٨) ١٤٣٦هـ، ص٦٥ـ٨٦.

(٢) بگەڕێرەوە بۆ: محمد توفيق ووردي، نوروز وثورة كاوه، مطبعة الغري(النجف الأشرف : ١٩٧٣)، حیلمی عەلی شەریف، داستانی نەورۆز و نەورۆزی کوردستان، دار الحرية للطباعة (بەغدا:١٩٩١)، ئەحمەد زەردەشت، کاوە و نەورۆز، ئەفسانە و بیری نوێ (بەغدا:١٩٩٩).

(٣) بگەڕێرەوە بۆ: حسين عزيز روانزی، نەورۆز لە شیعری کوردیدا، چاپخانەی الحوادث (بەغدا:١٩٨٥)، محەمەد عبدالرحمن زەنگەنە، نەورۆزنامە، دار الجاحظ (بەغدا: ١٩٨٥)، عومەر ئیبراهیم عەزیز، دیاریی نەورۆز لە پەخشانی کوردیدا (هەولێر: ١٩٨٩).

(٤) بگەڕێرەوە بۆ: د.رەفیق محەمەد شوانی، نەورۆز سەرەتای شارستانیەت و جەژنی نەتەوایەتیی کوردە، ئەکادیمیای کوردی (هەولێر:٢٠١٤).

دایدەنێن[1].

دیارە لەم کتێبانە و لە دەیان کتێب و توێژینەوە و گوتاری دی، کە دەربارەی پەیوەندیی نەورۆز بە کورد و کوردستانەوە دانراون، چەردەیەك زانیاریی نوێ و بۆچوون و لێکدانەوەی زانستی لەمەڕ ئەم پەیوەندییە خراونەتەڕوو، بەڵام پتر جەخت لەسەر لایەن و رووە ئەفسانەییەکانی نەورۆز کراوەتەوە و هۆکار و پاساوەکانی سەرهەڵدان و گەشەسەندنی لە نێو هۆز و نەتەوەکانی ئێراندا دەستنیشانکراوە و دەگمەن باس لە نەورۆز وەك مێژوو کراوە، پێویستە ئەوەش بڵێین کە نوسینی زۆروزەبەندی نازانستی و پڕ لە زیادەڕەوی و لێکدانەوەی سۆزدارانەش کەم نین کە راستیەکانیان شێواندووە و لە گیانی بێلایەنی و میتۆدی زانستی دوور کەوتونەتەوە.

ئەوەی راستی بێت کتێبی(نوروز والأزدهاك والكورد)[2]، یەکێکە لە کارە زانستیە دەگمەن و ناوازەکان لەمەڕ ئەفسانەی نەورۆز و پاڵەوانەکانی لە جەمشید و زوحاك و کاوە و نوسەر لە دانانی دا، سەرباری سەرچاوە عەرەبی و فارسییە کلاسیکیەکان، سوودی لە دەیان لێکۆڵینەوەی نوێی فارسی و ئەوروپی وەرگرتووە و شارەزایانە

(١) بگەڕێرەوە بۆ: د. مەولود ئیبراهیم حەسەن، نەورۆزی کورد ..لە ئەفسانەوە بۆ جیهانی بوون، دەزگای بەدرخان (هەولێر:٢٠١٢)، عەباس سلێمان سمایل، جەژنی نەورۆز لە کوردستانەوە سەری هەڵداوە، چاپخانەی رۆشنبیری (هەولێر:٢٠١٣).

(٢) د.عبدالرحمن مزوري، نوروز والأزدهاك والكورد، دراسة في الأسطورة والتأريخ، منشورات الأكاديمية الكردية (أربيل: ٢٠١٣).

بۆچوونەکانی خۆیی پێ پشتڕاستکردووە و ئێمە لە بەشی یەکەمدا کەڵکمان لێ وەرگرتووە.

ئەم کتێبەی ئێمەش هەوڵێکی دیکەی ئەکادیمی و زانستییە بۆ ساخکردنەوەی ئەم بابەتە، بە پشتبەستن بە دەیان سەرچاوەی فارسی و عەرەبیی رەسەن، وێڕای سوودوەرگرتن لە نوێترین لێکۆڵینەوەی توێژەرانی ئێران.

لەم کتێبەدا، هەوڵمداوە هەندەی بکرێت و تا چەند دەستبدات، خۆم لە دووبارەکردنەوە و چەند بارەکردنەوەی زانیاریە گشتی و زانراوەکان بەدوور بگرم و کەمتر خەریکی لایەنە ئەفسانەیی و فانتازییەکان بم کە زیاد لە پێویست دووپاتکردنەوە و درێژدادڕیی دەرهەق کراوە، لێرە زیاتر مەبەست سۆراخکردنی نەورۆزە لە هزر و یادەوەری و خەیاڵی تاکی کورد دا و دۆزینەوەیەتی لە ژیانی واقیعیی جڤاکی کوردەواری و راستیی مێژوویی- با کەمیش بێت- نەك ئەفسانە بخرێتەڕوو، کە وابزانم هەندێکیان نوێن و پێشتر نەدەزانران و دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمانی پاش دەرکەوتنی ئیسلام، تا زیندووکردنەوەی ئاهەنگی نەورۆز لە لایەن پیرەمێرد(١٨٦٧- ١٩٥٠)ی نەمرەوە، چونکە زانیاریەکی ئەوتۆ نیە پەیوەستبێت بە کوردستانەوە و بگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی پێشتر،

بە ئاخافتنێکی دی، لەم کتێبەدا لە نەورۆز دەدوێن پتر وەك مێژوو نەك وەك ئەفسانە- هەرچەند ناکرێت ئاخافتن لەدور نەورۆز بەدەر بێت لە باسکردنی رەهەند و لایەنە ئەفسانییەکانی- و گەرەکمانە بزانین ئەم ئەفسانەیە چ کاریگەرییەکی لە مێژووی کوردا هەبووە و چۆن و تا چ رادەیەك لە ژیانی مرۆڤی کورددا رەنگی داوەتەوە.

کاتی خۆی لەگەڵ بەڕێز زریان سالار حاجی کە خوێنکاری دکتۆرا بوو لە زانکۆی سلێمانی، وا ڕێککەوتین کە بە سەرپەرشتیی من، نامەی دکتۆراکەی بۆ نەورۆز تەرخان بکات، کەچی دوای ماوەیەکی کەم بە پاساوی نەبوونی زانیاریی پێویست دەستبەرداری ئەم بیرۆکەیە بوو و هەقیشی بوو، منیش لەو دەمەوە بڕیارمدا بەخۆم شتێك لەمەڕ نەورۆزی کوردەواری بنووسم و کەوتمە کۆکردنەوەی زانیاری و سەرئەنجام ئەم کتێبەی لێ بەرهەمهات[١].

لە کۆتاییدا ڕێز و پێزانین ئاڕاستەی ئەم دوو خوێنکارەی خۆم دەکەم : د. نزار ئەیوب گولی کە دوو دەقی بەهاداری بۆ ناردم و د.زریان حاجی کە ئەرکی دیزاینی کتێبەکەی لە ئەستۆگرت و پێویستە سوپاسی ڕێزداران: ژێهات محەمەد بناڤی و هێرش کەمال ڕێکانی یش بکەم کە لە دانانی ئەم کتێبەدا، بە دەق و بە تایپکردن هاریکارییان کردم.

دهۆك ١ـ٣ـ٢٠١٧

---

(١) پێشتر لەسەر داوای برادەرانی ئەکادیمیای کوردی، بە گوتارێك بەشداریم کرد لەو کتێبەی وا ئەکادیمیا لەسەر نەورۆز بڵاویکردەوە، بڕوانە: نەورۆز، ئەفسانە، مێژوو، ئەکادیمیای کوردی (هەولێر: ٢٠١٣)، ل١٥ـ ٣٢، ئەوگوتارەم دوای لێ زیادکردنی، بووە بەشێك لەم کتێبە.

## ١-١- جەم- جەمشید:

پاڵەوانەکانی ئەفسانەی نەورۆز: جەم- جەمشید و ئەژنیها- زوحاك و فەرەیدون[١]، دەگەڕێنەوە بۆ رۆژگارێك کە هێشتا هۆز و خێڵە هیند و ئێرانییەکان یەك نەتەوە بوون و لێکجودا نەبوبوونەوە و هاوزمان و هاوفەرهەنگ و هاوئایین و خاوەند یەك شارستانیی هاوبەش بوون، خوداوەند و پاڵەوانەکانی داستان و ئەفسانەکانیانیش هەر هاوچەشنن و تەنیا جیاوازییەکی کەم لە ناویان بەدیدەکرێت.

بەگوێرەی بۆچوون و لێکدانەوەی نەتەوەی فارسی سەردەستە و دەسەلاتدار، جەم یان جەمشید- واتا تیشکی جەم- کوڕی تەهمورسی کوڕی هۆشەنگی کوڕی سیامکی کوڕی کیۆمەرسی پێشدادی، داهێنەری نەورۆزە، ئەو لێکدانەوەیەی کە لە ئەنجامی هۆکارگەلێکەوە زۆر زیاتر لە لێکدانەوەکانی دیی لەمەڕ هاتنەکایەوەی نەورۆز، لە مێژوودا چەسپا.

کیۆمەرس لەکن نەتەوەکانی ئێرانزەمین و بەگوێرەی ئەفسانە و گێڕانەوەکانیان، یەکەم مرۆڤی سەر گۆی زەوی و یەکەم شاهی جیهانە و داهێنەری زۆر شتە و هاوشانی ئادەمە لای سامیەکان و بە گلْ شاه واتا شاهی گلْ- خۆڵ یان کورشاە- شاهی چیا دەناسرا، چۆنکە لە چیاکاندا دەژیا[٢]، هەواڵزانانی دی دەیخەنە نێوان ئادەم و نوحەوە و

(١) فەرەیدونی هیندوئێرانی بەرانبەر پێغەمبەر نوح یان پێغەمبەر ئیبراهیم خەلیلە لای یەهود و سامیەکان.

(٢) المسعودي، التنبيه والاشراف، ص٩١، الفردوسي، الشاهنامە، الترجمة العربية: ابوالفتح البنداري، ص١٣، البيروني، الآثار الباقية، ص٤٨.

هەشە دەیکاتە نەوەی نوح...[1].

جەم لە ئاڤێستا بە (ییمە) هاتووە و لە کتێبی پیرۆزی(رێگفیدا)ی هیندی کە بە زمانی سانسکرێتی نوسراوە، جەم یان یەما هاوشێوەی رۆژە وئاگری رووی زەویە وەك چۆن رۆژ ئاگری ئاسمانیە و هەر ئەویشە مرۆڤی یەکەمی سەر رووی زەوی و بابی ئادەمیزاد[2]و زیاتر لەوە دەچێت هاودەم و بەرانبەری سلێمانی کوڕی داودی پێغەمبەری جوو- یەهود بێت.

## ١-٢- ئەژدیها پاڵەوانێکی نەورۆزی کوردەواری:

ئەژدیها یان ئەژدەهاك- زوحاك کە بە بیوراسپیش ناودەبرێت، پاڵەوانێکی سەرەکیی نەورۆزی کوردە و ئەوە کە شاهێکی بێبەزەمی و خوێنرێژ و ستەمکارە و هێمای زۆرداری و تاریکی و ناخۆشی و بێدادیە و مایەی کوێرەوەری و ناسۆری وماڵوێرانیی خەڵکانی هەژار و نەدار و بێدەرەتانە، بێگومان دەمی زاڵبوون بەسەریدا و لەناوبردنی یان کۆتوبەندکردنیشی، رزگاری و سەرفرازی و کامەرانی لێدەکەوێتەوە و دەبێتە رۆژێکی نوێی تەواو جیاواز.

ناوی ئەژدیها لە ئاڤێستا بە(ئەزی دهاکە)هاتووە و دێوێکی بەرجەستەکەری شەڕانگێزیە و ناهێلێت ئاوی هەورەکان بباریتە سەر زەوی و وا بڵاوە کە هەر خودی نەمرودە[3]، کەچی لە شاهنامەی

---

(١) حمدالله مستوفی، تأریخ گزیده، ص٧٥.

(٢) ر.س.زیهنیر، المجوسیة الزرادشتیة، ص١٥٦-١٥٩.

(٣) ابوهلال العسکري، الأوائل، ص٤١٣.

فیردەوسیدا شاهێکی عەرەبە بە ناوی بیوراسپی کوڕی مرداس و نازناوی زوحاکە[1].

گومان لەوەدا نیە کە ئەژدەهاك ـ بیوراسپ، بەو شێوەیەی وا ناسێنراوە و بڵاوبۆتەوە، کەسایەتیەکی خەیاڵیە ودوورە لە واقیع و لە مێژووەوە، بۆیە لەنێو سەرچاوە فارسی و عەرەبیەکاندا، کراوەتە بنیادنەری (بیت المقدس) و کۆشکی غەمدان لە یەمەن[2]و بکەری چەند کردەوەیەکی نائاسایی[3]، فرە بۆچوونی و مشتومڕێکی سەختیش هەیە سەبارەت بە: ناوی خۆی و باوکی، ناسنامە و بنەچە و سەردەمی، ماوە وشوێنی حوکمکردنی کە بە چەند شێوازێك باسکراون[4]، هەر بەگوێرەی حیکایەت و گێڕانەوە بێ بنەماکان، نەژاد و بنەچەی ئەژدەهاك ـ زوحاك بووەتە بابەتێکی گەرمی ململانێی نێوان فارس و عەرەب نەخاسمە عەرەبی یەمەن[5]، هەر بۆ نموونە، شاعیری ناسراو ئەبو نەوواس:م ١٩٨ك/٨١٤ز) دیگووت زوحاك لە خۆیانە:

---

(١) الفردوسي، الشاهنامه، ص٢٥، ٣٧ـ٣٨.

(٢) المسعودي، مروج الذهب، ٢/٢٠٥، ٢٠٨..

(٣) مەسعودی دەڵێت:" وللفرس في أخبار الضحاك مع إبليس أخبار عجيبة وهي موجودة في كتبهم"، مروج الذهب، ٢/١٠٧..

(٤) بڕوانە: د.حسين قاسم العزيز، الجذور الأسطورية لملحمة نوروز الشعبية، ص٢٠٨ـ ٢٢١.

(٥) تأريخ الطبري، ١/١٩٤ـ ١٩٦، مەسعودی دەڵێت:"وقد تنوزع فيه: أمن الفرس كان أم من العرب؟"، مروج الذهب، ١/٢٠٦، و" أن الضحاك ذا الأفواه المقدَّم ذكره في هذا الكتاب الذي تنازعت فيه الفرس والعرب من أي الفريقين هو"، مروج الذهب،

كان منّا الضُحاك يعبده

......الخابل والجن في مساريها(1).

هۆزی(الأزد)یش شانازییان بەوەوە دەکرد کە زوحاك لەوانە، لەمەش سەیرتر زوحاك کراوەتە شاعیر و شیعری بۆ چێکراوە:

أَنَا ابْنُ عَدْنَانَ الْمُنْتَمِي

.......صُعُدًا إِلَى النَّبِيِّ الَّذِي لَهُ الْكُتُبُ

سُمِّيتُ فِي الْمَهْدِ إِذْ تَسَمَّيْتُ......

.......ضَحَّاكًا وَكَذَا الْأَسْمَاءُ يُقْتَضَبُ

لَسْتُ بِضُحَّاكِهِمْ وَلَا غَزِلٍ.........

.......صَبٌّ وَلَا مِنْ قَبَائِلِ اللَّعِبُ

لَكِنَّنِي السَّيِّدُ الْقَلَمْسُ لَمْ يُخْلَقْ.....

.......مِثْلِي قَبْلَهُ وَلَمْ يَكُنْ عَرَبُ(2).

## ١-٣- ئەژدیها لای گەلانی دێرینی ڕۆژهەلات:

بیرۆکەی هەبوونی ئەژدیها یان ماری حەفتسەر(التنين)، وەك دڕندەیەکی بەدفەڕ و چڵێس و دوژمنێکی نەگریس و سەرسەختی خوداوەندە خێرخوازەکان، بیرۆکەیەکی زۆر کەونار و هاوبەشی هەموو

---

٢/١٠٧ , قَالَ أَبُو الْمُنْذِرِ: فَالْفُرْسُ تَزْعُمُ أَنَّهُ مِنْهُمْ، وَالْعَرَبُ تَزْعُمُ أَنَّهُ مِنْهُمْ"، ابوسعيد النقاش، فنون العجائب، ص١١٤.

(١) تأريخ الطبري،١/١٩٨، مروج الذهب، ٢/١٠٧.

(٢) فنون العجائب، ص١١٥.

مرۆڤایەتیە و لە زۆریەی شارستانیەت و بیروباوەڕە ئایینیە سەرەتاهی و دێرینەکاندا ئامادەیی هەیە. لە داستان و ئەفسانەکاندا، جەنگان و بەرەنگاربوونەوەی ئەژدیهای بەدکار و زاڵبوون بەسەریدا، دواییش کوشتن و سەربڕینی یان کۆتوبەندکردنی بە دەستی خوداوەند و شاه و مرۆڤە نیمچە خوداوەندەکان، هەردەم چیرۆکێکی بەپێز و خوازراو و سەرنجڕاکێش بووە لەکن گشت میللەتان و لە سەردەمانی هەرەکۆنەوە بایەخی پێدراوە و دانەرانی ئەفسانەکان بەشێکی بەرهەمەکانیان بۆ تەرخانکردووە، نیگارکێشانیش بە وێنە و نیگار گوزارشتیان لە شەڕ و پێکدادانی کردووە لەگەڵ خوداوەند و شاهەکان[1].

لە دەستپێکی داهێنانی بیرۆکەی هەبوونی ئەژدیها و لە کۆنترین ئەفسانەدا، داهێنەران و نوسەرانی بەسەرهات و داستانەکان، وێنایەکی دیاریکراویان بۆ ئەژدیها لە خەیاڵدا نەخەملێبوو. لەم سەردەمەدا، ئەم هێزە کێوییە ترسناك و شەڕانیە، لە قۆناخی نادیاری و نەناسراوی مابووەوە و هێشتا فۆرم و روخساری خۆی وەرنەگرتبوو، پاشتر لە شێوەی ماری حەفتسەر بەرجەستەکرا. ئەوەی تا هەنوکە ساخبۆتەوە، کۆنترین نیگاری ئەژدیها دەگەڕێتەوە بۆ شارستانیەتی وڵاتی دوو ئاوان ـ میزۆپۆتامیا لە هەزارەی سێهەمی بەر لە زایین کە لەبان مۆرێکی لولەیی نەخشێندراوە و چەند پاڵەوانێك دەردەخات کە چۆن چەند پاڵە وانێکی جەنگاوەر

(١) صموئيل كريمر، من ألواح سومر، ص٣٣٧، فاضل عبدالواحد علي، سومر أسطورة وملحمة، ص١١٤.

ئەژدیهایەکی حەفتسەر لەناو دەبەن[1].

لە سەردەمی ئیسلامیشدا، خەڵکی وێنای ئەژدیهای بە زیاتر لە شێوەیەك لەلا چەسپیبوو، بۆ نموونە دەگوترا رەشەبایە و لە ناخی دەریاکانەوە هەڵدەکات یان رەشمارە یان ئاژەڵێکە لە دەریاکاندا خولقاوە[2].

ئەژدیها وەك روونە گیانەوەرێکی ئەفسانەییە و خەیاڵدانی مرۆڤی کۆن لە دێرزەمانەوە دایهێناوە و گوایە لە دارستان و جەنگەڵ و ناوچە شاخاوییە بژوێن و دوورەدەستەکان خۆی مەڵاسداوە، تا ببیکاتە چاوگە و سەبەبکاری هەرچی کار و کردەوەی خراپی مرۆڤەکانە یان بیکاتە سەرچاوەی رووداو و دیاردە سروشتیە زیانبەخشەکان لە وێنەی باهۆز و لافاو و وشکەساڵی و زەویلەرزە و رۆژگیران...، هەر بۆیەش دەبوو لە خەیاڵی دا وێنەیەکی کرێت و ناقۆڵای بۆ بکێشێت کە هەم کەتە و درێو و هەم ترسناك و سامدار بێت، هەندێك جار وەك تیمساحێکی باڵدار و چاوتیژ و چوارپەل خراوەتەڕوو کە هەر پەلێکی چڕنوکی زلی پێوەیە و لە دەمیەوە ئاگر دەبارێنێت، یان هاوڕوخساری شامارێکی چەتەوڵی یەك سەر یان فرە سەرە و دوو چنگی گەورە و درێژی پێوەیە و زمانی لە دەمی دەرچووە. لە وێنە و نیگاری دیدا، بریتیە لە لاشەی مار و کەلەی تیمساح و چڕنوکی شێر و باڵی باڵندە و ئاگری لە دەم دێتەدەرەوە و

(١) کارم محمود، أساطير التوراة الكبرى وتراث الشرق الأدنى، ص١٠٢. و بڕوانە وێنەکەی لە کۆتاهی ئەم بەشە.

(٢) المسعودي، مروج الذهب، ١/١٢١ـ١٢٢.

پێچخواردووە و جەستەشی ئەوەندە زەبەلاحە تا ئەو رادەیەی مەڕ و ماڵات هەڵدەلوشێت[1].

لە پاشماوەی نوسراوە سۆمەرییەکاندا، سێ ئەفسانە ماونەتەوە سەبارەت بە کوشتن و سەربڕینی ئەژدیها و یەکێکیان وەك بەشێك لە داستانی گلگامش تۆمارکراوە. لە ئەفسانەیەکی دییاندا، ئەژدیها پەیوەندیی راستەوخۆی بە ئەژدیهاکەی لەمەڕ نەورۆزەوە هەیە، واتا ئەوەی کە لای عەرەب بووە بە زوحاك کە ناوی بە شێوەکانی: ئەساج، ئەساگ، ئاساگ، ئەساگۆ خوێندراوەتەوە و لە دەقێکدا کە لە شەڕی دژی گۆتییەکان دەدوێت، ناوی براوە[2].

زانای ئەڵمانی د.أ. ئیدزارد(١٩٢٠-٢٠٠٤) لە ناسینی ئەساگ-ئەژدیهاك دەڵێت: "ئەساگ دێوێکی سۆمەرییە و لە زمانی ئەکەدیدا ناوی بووەتە ئەساکو، لە بنەڕەتدا بەرپرسیار و هۆکاری پەتا و نەخۆشی بوو، پاشان کرایە دێوێکی دوژمنی وڵاتی سۆمەر کە لە کێوەکان دەژیا و خوداوەندەکانی وەك ئینەننا و نینۆرتا، هێرشیان دەکردە سەری"[3]، هەروەها لە هەندێك دوعا و نزا و پاڕانەوەی سیحراویدا، باسی شەیتانی ئەساگۆ کراوە[4].

(١) أساطير التوراة الكبرى، ص١٠٢، سومر أسطورة وملحمة، ص١١٤-١١٥، رينيه لابات، المعتقدات الدينية في بلاد وادي الرافدين، ص١٥١-١٥٢.

(٢) كريمر، من ألواح سومر، ص٣٤٠-٣٤١، د.أ.إدزارد، قاموس الآله والأساطير، ص١١٧، سومر، أسطورة وملحمة، ص١١٦-١١٧.

(٣) قاموس الآله والأساطير، ص١١٧.

(٤) سومر، أسطورة وملحمة، ص٦٩-٧٠.

لە لایەکی دیبەوە، پەیڤی کور لە زمانی سۆمەرییەدا، لە بنەڕەتدا بە واتای چیا و کێو و وڵاتی شاخاوی دەهات، پاشان بەهۆی ئەوەوەی کە ناوچە شاخاویەکانی هاوسنووری وڵاتی سۆمەر و ئەکەد کە مەبەست زنجیرە چیاکانی زاگرۆسە، نزیکترین ناوچەی شاخاویە لێیانەوە و هەردەم سەرچاوەی سەرەکیی گەف و مەترسی بوو بۆ سەر شارستانیەت و ئاوەدانیی وڵاتی سۆمەر و دانیشتوانی ئەم ناوچە شاخاویانە، لۆلۆییەکان و گۆتییەکان بوون و خەڵکانی نامۆ و نەیار و بیانی بوون بۆیان، بۆیە سنوری بەکارهێنانی پەیڤی کور گۆڕانکاریی بەسەردا هات و چەمکەکەی فراوانبوو و واتای وڵاتی بیانی یان وڵاتە شاخاویەکانی دەگەیاند[1].

لە رووی بیروباوەڕی ئایینیەوەش، وشەی کور واتای جیهانی مردووان یان جیهانی ئاخیرەتی دەگەیاند، ئەو دنیایەی تارمایی هەموو مردووەکانی بۆ دەڕوات.

## ١-٤- گۆتییەکان هاوچەشنی ئەژدیها:

گۆتییە کێوییەکان وەك لە تێکستە سۆمەری و ئەکەدیەکاندا بەدیدەکرێت- کە راستەوخۆ و دەقاودەق دەربڕی دید و هەڵوێستی ئەوانە دەرهەق گەلێکی ناحەز و دوژمنیان-، گەلێکی شاخەوانی چاونەترس و شەڕکەربوون و ئەوەندە گوێیان نادا بە شارستانیەت و

(١) صموئيل كريمر، من ألواح سومر،ص ٣١٥، د.أ. إدزارد، قاموس الآلة والأساطير، ص١١٣، نائل حنون، عقائد مابعد الموت، ص١٧٧.

نیشتەجێبوون و هۆگری كێوەكان بوون و گەورەترین گەف و هەڕەشە و ترسناكترین دوژمنی وڵاتی سۆمەر بوون و بوویبوونە سەرچاوەی ترسولەرز و تۆقاندن و مایەی تێكدانی ئارامی و هێمنیی ناوچەكە، ناوبەناو پەلاماری گوند و ئاوەدانیەكانی ناوچە دەشتاییەكانیان دەدا و دەستی خۆیان دەوەشاند و خۆشگوزەرانیی وڵاتیان تێكدەدا و دەكەوتنە تاڵانكردن و بە دەستكەوتەوە هەڵدەكشانەوە بارەگاكانی خۆیان.

لە نزیكەی ساڵی ۲۲۳۰پ.ز دا، هێرشێكی بەربڵاویان كردە سەر وڵاتی سۆمەر و ئەكەد و دەوڵەتی ئەكەدی(۲۳۷۰-۲۲۳۰پ.ز)یان لەناوبرد كە سەرجۆنی ئەكەدی دایمەزراندبوو و بۆ ماوەی سەدە و چارەكێك حوكمی پانتاییەكی بەرفراوانی وڵاتی دووئاوانیان كرد و لەم ماوەیەدا بیست - بیست ویەك شاهیان حوكمیكرد.

لە دوا ساڵەكانی سەدەی بیست ودووی بەر لە زایین، بە دەستی شاه ئۆتۆحیكالی سۆمەری دەسەڵاتیان لەنێوبرا و كشانەوە بۆ باكور و شاری ئارابخایان- كەركوكی ئێستا- لەم ماوەیەدا بنیادنا، دوای ئەم سەركەوتنە، ئۆتۆحیكال نازناوی شاهی هەردوو وڵاتی سۆمەر و ئەكەدی لەخۆی نا[1].

لەناوچوونی دەسەڵاتی سیاسیی گۆتییەكان و كشانەوەیان بۆ كێوەكانی زاگرۆس، نەبووە مایەی ئەوەی كە هێز و شیانی لەشكرییان

---

(۱) كريمر، السومريون، ص٤٩-٥١، طه باقر، مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة، ص ٧٥، ٤٠٧-٤١٤.

نەمێنێت یان تارماییان بڕەوێتەوە، بەڵکو هێشتا ترسناکترین دوژمنی وڵاتی سۆمر و ئەکەد بوون و لە نوسراو و دۆکیومێنتە ئەدەبی و ئایینیەکانی سەردەمی بەرەبابی سێهەمی ئوور(Ur) دا، هەست بە تارماییان دەکرێت و ترس و نیگەرانی و دڵەڕاوکێی سۆمەرییەکان لە دێوەزمەی گوتی بە زەقی رەنگیداوەتەوە، لە دەقە سۆمەری و ئەکەدیەکاندا ئاوەها باسی گوتییەکان دەکرێت:

- " گوتییەکان کوڵەوەبیاب و دووپشکی کێوەکانن، ئەوانەی دەستیان بە ڕووی خوداوەندەکاندا هەڵماڵی و شاهنشینی سۆمەرییان گواستەوە بۆ وڵاتی بیانی و خاکی سۆمەریان پڕکرد لە دوژمنایەتی و ژنیان لە ئامێزی مێردەکەی و زاروکیان لە کۆشی دایك و باوکی رفاند"[1].

- "مار و ئەژدیهای کێوە سارد و سڕەکان و دوژمنی خوداوەندەکان"[2].

- " گەلێکن دەستەمۆ ناکرێن و لە وڵاتێکەوە هاتوون ناهێتەگرتن و دانیشتوانەکەی لە ژمارە ناهێن، خوداوەند ئەنلیل ئەمانەی لە چیاکانەوە شۆڕکردەوە و بێ شومار هاتن و وەك کوللـەزەرد زەوییان داپۆشی و دەستدرێژییان کردە سەر ناوچە دەشتاهیەکان...نە هیچ شتێك لە چنگیان دەربازی بوو و نە هیچ کەسێکیش توانیی لە دەستیان هەڵبهێت، بۆیە نە نامەبەران لە ڕێگاکاندا ماون و نە گەمیەوانان لە کەشتیەکانی ناو رووبار، چاودێرانیان لە پۆپی دارەکاندا داناوە لە قەراخ کەناری رووبارەکان، ڕێگرانیش لەسەر ڕێگاوبانەکان، دەروازەکانی شار

(١) سومر أسطورة وملحمة، ص٧٠.

(٢) مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة، ص٤١٤.

کەوتنە ژێر خۆڵ و خاشاکەوە و نیشتمان هاوارێکی غەمگینی لەناو شوراکانییەوە لێ هەڵدەستێت"[1].

بۆ هەزاران ساڵ، گۆتییەکان بوویوونە نێوەزمەی دانیشتووانی وڵاتی سۆمەر و ئەکەد و هەردەم تارماییان نەدەڕەولیەوە و پێشبینیی سەرهەڵدانەوە و شاڵاوهێنانی کوتوپڕیان دەکرا، ئەم شڵەژان و دڵەڕاوکێ نەبڕاوەیە و ئەم دۆخە دەروونیە ئاڵۆز و نالەبارەی توشی حکومەت و جڤاکی سۆمەری هاتبوو، سەرباری تێکستە مێژووییەکان، بە روونی لە ئەدەبی سۆمەریش رەنگی داوەتەوە و لە ئەفسانە و داستانەکاندا وێنا کراوە و لە شێوەی دوعا و نزا و شیوەن داڕێژراوە، زانای فەرەنسی رینیە لابات(١٩٠٤-١٩٧٤)دەڵێت: گۆتییەکان لای سۆمەریەکان، کۆمەڵە خەڵکانێکی شەڕانی و جەریەزە بوون و هیچ رێزیان لە خوداوەندەکان ناگرت و بگرە دوژمنیان بوون، وەك چۆن رەفتار لە ئاست گوێدرێژ دا دەکرێت، ئاوەها هەڵسوکەوتیان لەگەڵ میللەتانی وڵاتی سۆمەر و ئەکەددا دەکرد[2].

نینۆرتا کە خوداوەندێکی سۆمەریە و کوڕی خوداوەند ئەنلیلە و دواتریش ئەکەدیەکان بە هەمان ناوەوە خواستیانەوە، لە بنەڕەتدا بەرپرسی کشتوکاڵ و چاندن و پیت و بەرەکەتی کێڵگەکان و زاووزێی مەڕو ماڵات بوو، کەچی پاش ئەوەی گۆتییەکان پەیدابوون و بوونە مەترسیی راستەقینە بۆ سەر ئاسایش و تەناهیی ناوچەکە، ئەم

(١) سومر أسطورة وملحمة، ص٦٩-٧٠.

(٢) المعتقدات الدينية في بلاد وادي الرافدين، ص٢٧٨.

خوداوەندەش بەگەڕخرا و کار و ئەرکی گۆڕدرا بۆ جەنگان و کرایە خوداوەندێکی جەنگاوەر(1).

نینۆرتا کاتێك دەبیستێت ئەژنیهای ئەساگ هاوسەرگیری لەگەڵ کور- کێو کردووە و کوڕێکیان بووە و کردوویانە بە شاهێکی شەڕانگێز کە بەردەوام رادەبێت بە تاڵانکردنی شارەکان و کارێکی وایکردووە ددانی ئەژنیهاکان لە لوتکەی چیاکانەوە بڕوێن و سەردەربهێنن، یەکسەر پەلاماری دەدات و لەگەڵی دەکەوێتە شەڕەوە و بەسەریدا سەردەکەوێت. بە ڕا و لێکدانەوەی پسپۆڕان و شارەزایانی مێژووی عێراقی کۆن، ئەم ئەفسانەیەش رەنگدانەوەی هەلوێست و تێگەهیشتنی دانیشتوانی باشووری عێراقە دەرهەق گۆتییەکان و دەربڕی مەترسییانە لەم گەلە شاخەوانە جەریەزە و توندوتیژە و ویستوویانە بە خەیاڵات و ئەفسانە بەسەریاندا زاڵبین(2).

لە ئەفسانەیەکی تیدا، خوداوەند ئەنانا شاڵاو دەباتە سەر چیای ئەبێخ کە بەمەزندە یەکێکە لە چیاکانی زاگرۆس- کوردستان و چیایەکەش خۆی بەدەستەوە نادات، ئەم ئەفسانەیەش هەر ئاوێنەی بارودۆخی سیاسی سۆمەریەکانە و رەنگدانەوەی کێشە و ململانێیانە لەگەڵ گۆتییەکان و لەوانەیە دوای سەرکەوتنی ئۆتۆحیکال بەسەر گۆتییەکان دا دارێژرابێت و گوزارشت لەو سەرکەوتنە بکات.

هەر خوداوەند ئەنلیل بوو، گۆتییەکانی هاندا پەلاماری مەملەکەتی

(1) قاموس الآلهة والأساطير، ص٦٢، سومر أسطورة وملحمة، ص١٠١.

(2) سومر أسطورة وملحمة، ص١٠١.

نیرام سین بدەن، چونکە ئەم شاهە هەڵستابوو بە وێرانکردنی پەرستگاکەی لە شاری نەفەر و هەر ئەویش بوو وڵاتی لە چنگ گۆتییەکان دەرهێنا و رادەستی تۆتۆحیکالی کرد[1]، صمۆئیل نوح کرێمەر(١٨٩٧ـ ١٩٩٠) لەمبارەیەوە دەڵێت: لە رێگای سرود و تەراتیلە شاهانەکانەوە لەوە تێدەگەین کە گۆتییەکان ترسناکترین و پرگەڤترین دوژمنی وڵاتی سۆمەر بوون[2].

جگە لە گۆتییە شاخاویەکان، کێو و زنجیرە شاخەکانی کوردستانیش دوژمنێکی خۆڕسکی وڵاتی سۆمەر و ئەکەد بوون و چاوگی هەمیشەیی بەڵایەکی سروشتیی زیانبەخش بوون، چونکە ساڵانە لە ئاکامی توانەوەی بەفر و سەهۆڵدا، هەردوو روباری دیجلە وفورات هەڵدەستان و خوارووی عێراقیان ژێرئاو دەکرد، واتا هاوشانی مەترسیی گۆتییەکان، هەڕەشەی لافاویش دەبووە سەربار و سەرچاوەی هەردووکیانیش چیاکانی کوردستان بوو، بۆیە لە کۆتاهی رۆژی چوارەمی جەژنی سەری ساڵی بابلیدا کە یازدە رۆژی یەکەمی مانگی نیسانی دەخایاند، داستانی "ئینوما ئیلیش" بە سرود و سترانی ئایینیەوە دەخوێندرایەوە، کە رەنگە وەك ئەلیکساندەر هایدڵ(١٩٠٧ـ ١٩٥٥) دەڵێت بە مەبەستی نزا و جادوو بووبێت بۆ بەرگەگرتن لە لافاوی دیجلە وفورات کە لە ئەنجامی توانەوەی بەفری چیاکانی ئەرمینیا و کوردستاندا، بەهاران

(١) ولئل حنون، حقيقة السومرين، ص٦٩.

(٢) السومريون، ص٥١.

رادەبوون و بەهۆیەوە ساڵانە وڵاتی سۆمەر نقوومی ئاو دەبوو[1].

لێرەدا پێویستە بڵێین کە وەك هەمووان ئاگادارین، لە لایەن خەڵکانی نەیارەوە، ئەوانەی وا خۆشییان بە جەژنی نەورۆزدا نایەت، دەنگۆی ئەوە بڵاودەکرێتەوە کە گوایە نەورۆز پێشینەیەکی مێژوویی نیە لە کەلتوری نەتەوەیی کورد و داهێنانی پیرەمێردی شاعیرە لە سییەکانی سەدەی رابردوودا، لەمەش ترسناکتر دەگوترێت کە نەورۆز یادی ژێرکەوتن نەك سەرفرازیی کوردە و رۆژی سەرکەوتنی کورشی ئەخمینیی فارسە بەسەر ئەستیاگو- ئەژدیهای دوا شاهی میدیا(٥٨٥-٥٥٠پ.ز)، بەڵام ئەم تەرزە ئاخافتنانە هیچ بنەمایەکی زانستییان نیە و روون بۆتەوە کە ئەژدیهاکەی لەمەڕ نەورۆز، کاراکتەرێکی رۆژگاری بیرکردنەوە و لێکدانەوەی ئەفسانەییە بۆ رووداو و دیاردەکان و جگە لە لەیەکچوونی ناویان، هیچ نزیکی و پەیوەندییەکیان بەیەکدیەوە نیە و هەزاران ساڵیان لە نێوانە[2].

شایانی باسە کە کاتی خۆیشی ئەم تەرزە بوختانانە ئاراستەی پیرەمێردیش دەکرا و گوایە بە فیتی ئێران یان ئینگلیز یادی نەورۆز و ئاگرەکەی دەکاتەوە، ئەویش بە توندی بەدرۆی خستوونەتەوە[3].

(١) سفر التكوين البابلي، ترجمة: سعيد الغانمي، ص٣٣-٣٤.

(٢) نوروز والأزدهاك، ص٥١-٥٣.

(٣) سەرگوتاری رۆژنامەی ژین، ژمارە (٩١٠)، رۆژی١٨ی مارتی ١٩٤٨. بگەڕێرەوە بۆ: پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە، ئامادەکردنی سدیق ساڵح، بنکەی ژین (سلێمانی: ٢٠١٣)، ل٩٤-٩٥.

## ١-٥- شوێنەواری زوحاك لە کوردستان:

ئەوەی جێگای سەرنجە تا سەرەمی ئیسلامی، بگرە تا ئەمڕۆیش، شوێنەواری لکاندن و گرێدانی کەسایەتیی ئەژنیهاـ زوحاك بە کوردەوە، چ لە کوردستان وچ لە هزر و خەیاڵی کورد هەر ماوە. بەر لە هەر شتێك نەتەوەی فارس بەخۆیان، نەتەوەی کوردی ئامۆزایان پەیوەست دەکرد بە زوحاکەوە[1]، سەرەڕای ئەوەی چیایێکی کوردستانیش بە (التنین)ـ ئەژنیها ناودەبرا کە دەکەوتە تەنیشت کێوی ناودار و مێژوویی جودییەوە[2]، بەپێی وەصفی مەسعودی (م: ٣٤٦ك/٩٥٧ز) کە بەخۆی ناوچەکەی بینیوە، ئەم چیایە دەکەوتە بەرانبەر جودی و رووباری خاپوور بە نێوانیاندا تێدەپەڕی[3]. تا ئێستاش قەڵا و ئەشکەفتێك لە گوندی نەوێی بناری شاخی سورێن لە شارەزور هەیە کە بە زیندانی زوحاك دەناسرێت و رەنگە هەمان ئەو زیندانەی شارەزور بێت کە وەك لە شاهنامەی فیردەوسی هاتووە ئەسکەندەری مەکدۆنی دیل و نەیارانیی تێدا بەند دەکرد.

پاشماوە و شوێنەواری پەیوەندیی نێوان زوحاك و شارەزور، لە ناوی جوگرافی و لە حیکایەتی میللیی کوردەواریدا رەنگی داوەتەوە، ئەوەتا لە هەواڵێکدا هاتووە کە شارەزور بە دەستی زوری کوڕی زوحاك ئاوەدان کراوەتەوە و بۆیە ناونراوە شاری زور- شارەزور و موصڵیش

(١) ابن قتيبة، المعارف، ص٦١٨، مروج الذهب، ١٠٧/٢.

(٢) ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٤٦١/٣.

(٣) التنبيه والاشراف، ص٥٤.

راوەندی کوڕی زوحاک ئاوەدانی کردۆتەوە[1]، گەڕۆکی عوسمانی میتراقی زادە- ساڵی ١٥٣٤ز- شارەزور بەو شوێنە دادەنێت کە شاهی ماران واتا ئەژدیهای تیادا دەژێت[2] و شێخ مارفی نۆدێ (١٧٥١-١٨٣٧) لە داخوازنامەیەکدا بۆ سوڵتان سەلیمی سێهەمی عوسمانی(١٧٨٨-١٨٠٧ز) کە بە قەصیدە هۆنیویەتیەوە، دەڵێت کوردستان کە زیاتر مەبەستی شارەزور و مەملەکەتی بابانە، وڵاتێکە شاخی شەیتانەکانی تیایدا سەری دەرهێناوە:

بِلادٌ بِها قَرن الشياطين طالعٌ ... وكَم فتنة فيها مساعِر فِتنَةٍ[3].

دیارە سەرباری پێشینە مێژوویەکە، پاساوی ئەم پەیوەستکردنە بۆ ئەو دیاردە سروشتیەش دەگەڕێتەوە کە هەر لە کۆنەوە مار و دووپشك بە رادەیەکی نائاسایی لە شارەزور هەبووە و خەڵکەکەی هەراسان کردووە، تەنانەت شارەزور لە جیهان ئیسلامی دا بە زۆری و ترسناکیی دووپشکەکەی ناودار بوو و وەك نموونە دەهێنرایەوە[4] و لە دەمی فتوحاتی ئیسلامیدا، دووپشکی شارەزور گەلێك عەرەبی کوشت، لە مێژووی نزیکیشدا هاتووە کە خەڵکی گوڵ عەنبەر- خورماڵ پاش بەهاران لە ترسی مار کە لە درزی دیوارەکانەوە سەری دەردەهێنا، ماڵەکانیان چۆل دەکرد و روویان دەکردە هەردە و پاوەندەکان[5].

---

(١) معجم البلدان، ١٤٥/٣، ٣٢٩/٤، القزويني، آثار البلاد وأخبار العباد، ص٤٦١.

(٢) رحلة مطراقي زاده، ص٢٩.

(٣) الأعمال الكاملة للشيخ معروف النودهي (بغداد:١٩٨٤)، ٣١٩/٣.

(٤) الثعالبي، ثمار القلوب في المضاف والمنسوب، ص٤٢٤،٤٢٩.

(٥) بڕوانە: خورشيد باشا، رحلة الحدود، ص ٢٩٧.

هەروەها تا ئێستاش وشەی کور۔ کوڕ ی سۆمەری، لە زمانی کوردیدا واتای خۆی لەدەست نەداوە و هەر بە واتای چیا دێت، بۆ نموونە ناوچەی ناڤکوڕ۔ ناوکوڕ، لە دەڤەری بەردەرەش کە دەکەوێتە نێوان دوو چیاوە[1]، لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا بە(بين الجبلين) هاتووە کە هەر وەرگێڕدراوی ناڤکوڕە[2]، یان کوڕە کاژاو، واتا چیای کاژاو[3]و کوڕ کوڕ، واتا زنجیرە چیا یان چیایەکی درێژ و بن کوڕ کە گوندێکە لە گەرمیان و دەکەوێتە بن چیایێکەوە.

## ١-٦- کاوە و ئالاکەی:

ناوی کاوە، نە لە ئاڤێستا و نە لە دەقە پەهلەویەکاندا هاتووە، بەڵام بڕوای وا هەیە کە لەم دەقانەدا بەشێوەی کاوك هاتووە، هەرچەند ناوەڕۆکی دەقەکان ئەمە پشتڕاست ناکەنەوە، کەچی لە راستیدا، کاوك ناوی کاوەیە لە بەسەرهاتە مىللیەکان نەك لە زمانی پەهلەوی[4]، لە سەرچاوە ئیسلامیەکانیشدا، پتر ناوی بە شێوە فارسیەکەی هاتووە: کابی، کەمتریش بە کاوی[5].

---

(١) کلوديوس جيمس ريچ، رحلة ريچ سنة ١٨٢٠، ص٣٢٧. وبڕوانە: ياسين العمري، غرائب الأثر، ص٩٥.

(٢) العمري، مسالك الأبصار، ٣/٢٦٢، وبڕوانە: ابن المستوفي، تأريخ أربل، ٢/٨٦، ٣٦٨.

(٣) رحلة ريچ، ص١٦٦.

(٤) بڕوانە: مزوري، نوروز والأزدهاك، ص٧٨-٧٩.

(٥) المقدسي، البدء والتأريخ، ٣/١٤٢، ١٤٤، نوروز والأزدهاك، ص٧٢-٧٧.

سەبارەت بە ناسنامە و سەرگوزشتەی کاوە، دەقەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە گوایە پینەدۆز یان ئاسنگەرێکی هەژاری ئەصپەهانی بووە و لە نێو ژان و ئازاری خەڵکی خاکی و رەشۆکیی دەرکەوتووە و ئاڵایەکی پێستینی بڵندکردۆتەوە و داوای لە خەڵکی رەشوڕووت کردووە دژی ئەژدەهاک- زوحاک راپەڕن و تۆڵەی ئەو دوو کوڕەی لێبکەنەوە کە بردبوونی، خەڵکەکەش بەدەنگیەوە هاتوون و کاوە زوحاکی گرتووە و رادەستی فەرەیدونی کردووە، ئەویش بە کۆتکراوی لە چیای دەماوەند بەندی کردووە، پاشان خەڵکە دەربازبووەکەی دەستی ستەم و بێدادیی زوحاک، لەبەر خۆشویستنی کاوەی فریادڕەس و رزگارکەریان، ئاڵاکەیان لەکن پیرۆز بووە و زێڕبەندیان کردووە و وەك هێمای سەرکەوتن و سەرفرازی هەڵیان گرتووە و پاراستوویانە تا دواجار کەهیشتە دەست یەزدەگوردی سێهەمی دوا شاهی ساسانیەکان کە لە شەڕی قادسیە لە ساڵی ١٦ك/٦٣٧ز- یان لە شەڕی مەدائین یان شەڕی نەهاوەند- دژی عەرەبە موسڵمانەکان هەڵیکردبوو و دوای تێکشکانی لەشکری ساسانی کەوتەدەست سەرکردەیەکی عەرەب[1].

لێکۆڵینەوە نوێیەکان، گومان دەخەنەسەر ئەم گێڕانەوەیەی تەبەری و مەسعودی و فیردەوسی و سەرچاوەکانی دی دەرهەق کاوە و ئاڵاکەی و بە هەڵبەستراوی دادەنێن و ئەوەیان بۆ ساخبۆتەوە کە بابەتی کاوەی پاڵەوان و ئاڵاکەی و راپەڕینی دژی زوحاك، بەشێکی

(1) تأريخ الطبري،١/١٩٨-١٩٩، المسعودي، التنبيه والاشراف، ص٩١، الفردوسي، الشاهنامه، ص٣٦-٣٧، مسكويه، تجارب الأمم، ١/٥٦-٥٧.

بنەڕەتی نەبووە لە ئەفسانەی ئێرینی نەورۆز و داهێنراوی سەردەمی ساسانییە، لە راستیدا لە ئاڤێستا دا (گاووس دەرفشە) هاتووە بە واتای ئەو ئاڵایەی وا لە پێستی گا چێکراوە یان ئەو ئاڵایەی وێنەی گای لەسەر نەخشێنراوە، واتا ئاڵای کابیان ـ کاویان لە بنەڕەتدا ئاڵای گاویانە، نەك ئاڵای کەسێکی راپەڕیو بە ناوی کاوە، کەچی بە بیتنی ئێرانناسی دانیمارکی ئارسەر کریستنسن(١٨٧٥ـ ١٩٤٥) ئاڵای کاویان واتا ئاڵای شاهەکان یان ئاڵای شاهانە، چونکە لە زمانی ئاڤێستی کاوـ گاو بە واتای شاه دێت، ئەگەر ئەمە وابێت، نە کاوە و نە ئاڵاکەی هەر بوونیان نیە و گاوی بە هەڵە لەلای تەبەری و مەسعودی و فیردەوسی لێکدراوەتەوە و کراوە بە کاوی۔ کابی۔ کابیان[1].

ئەوەی شایانی ئاماژەیە، ئاڵاکەی کاوە یان ئاڵای کابیان لە خودی کاوە زیاتر ناوی دێت و لەکن مێژوونوسان و نوسەرانی سەردەمی ئیسلامی ناسراوترە، ئەو ئاڵا پیرۆزەی لە رۆژگاری هەژموون و باڵادەستیی عەرەب و ژێرکەوتن و مەینەتیی میللەتانی ئێراندا، کرابووە هێما و جەڤەنگ بۆ سەردەمانی سەروەری و بەختەوەریی ئێرانیەکان و بەردەوام شانازیی پێوەدەکرا و کرابووە چەکێکی بەرەنگابوونەوەی عەرەب و خەون بە بڵندکردنەوەی دەبینرا، تەنانەت مەجوس۔ زەردەشتیەکان سوێندیان بە پیرۆزیی دەخوارد[2] و لەمبارەیەوە شاعیر

(١) کریستنسن، إیران في عهد الساسانیین، ص٤٨٣، مزوري، نوروز والأزدهاك، ص٨١ـ٨٣، ٩١ـ ٩٢.

(٢) العمري، التعریف بالمصطلح الشریف، ص١٩٥ـ١٩٦.

ئیبراهیمی کوڕی مەمشادی ئەصپەهانی- سەدەی٣ك/٩ز- بە توندی توانج لە عەرەب و بنەماڵەی عەباسی دەگرێت و هەڕەشەی ئەوەیان لێدەکات کە ئاڵاکەی کاوە- کابیانی پێیە و هەڵی دەکات و دەوڵەت و سەروەرییەکانی جەمشید زیندوو دەکاتەوە:

أنا ابن الأكارم مِن نَسْلِ جَم.. وحائز إرث ملوك العَجم.

معي علم الكابيان الذي........به أرتجي أن أسود الأمم.

فقل لبني هاشم أجمعين.....هلمّوا إلى الخلع قبل الندم.

فعودوا إلى أرضكم بالحجاز.. لأكل الضباب ورعي الغنم[1].

لە شاعیرانی کوردیش، حاجی قادری کۆیی (١٨٢٥-١٨٩٧) چوار جار باسی کاوە و ئاڵاکەیی کردووە:

پەرچەم و فێسی کەچی تۆ ئەی جوان

تاجی کەیانە و عەلەمی کاویان

من لە غەمت ڕێگایەکم کەوتە بەر

خوانی بەهەشتە و سەفەری هەفت خوان[2].

لە شیعرێکی دیدا، خۆی بە کاوە و شیعرەکانیشی بە درەفشی- ئاڵاکەی کاوە چوواندووە:

یا ئیلاهی بە ئایەتی مونزەل

بە چوار یاری ئەحمەدی مورسەل

بێ ئەولیانی موڵکی کوردستان

---

(١) یاقوت الحموي، معجم الأدباء، ١/١٢٨-١٢٩.

(٢) دیوانی حاجی قادری کۆیی، ل٩٤.

**هەر لە گاوانێ تا دەگاتە شوان**

**لە خەوی جەهل و مەستی و غەفلەت**

**بە خەبەر بێن بە نەغمەیی رەحمەت**

**پاکی دەرچن لە کاری نا بە مەحەل**

**روومی رافڕێنن بۆ دەری ئەسفەل**

**حاجی یە شیعرەکانی وەك کاوە**

**رۆژێ دەبیبینن درەفشی هەڵداوە[1].**

**هەروەها دەڵێت:**

**فیدلیی لەنگەری دەستی سینانی کەیکاووس**

**درەفشی کاوە، رمی گێو و نێزەیی طووسی**

**کە هات و کەوتە سەما عیسەوی شکا و نەما**

**هەلا هەلایی کلیسا، سەدای ناقووسی[2].**

---

(1) دیوانی حاجی قادری کویی، ل١٩٤.

(2) دیوانی حاجی قادری کویی، ل١٦٢، و بڕوانە: ل٢٦٠.

## ٢-١- سەرهەڵدانی جەژنی نەورۆز:

بەر لەوەی لەم بابەتە بدوێین، دەبێت بڵێین کە ئەوەی جێگەی داخە و مایەی سەرسوڕمانە، لە سەرجەم سەرچاوەکان و لە دیوانی شاعیراندا، نەورۆز تەنها بە داهێنان و موڵکی فارس دانراوە و راستەوخۆ بە ئەوانەوە گرێدراوە و کورد و نەتەوەکانی دیکەی ئێرانیی لێی بێبەش و بێبەهر کراون، لە لێکۆڵینەوە نوێیەکانیشدا هەر ئەمە کوتومت دوپات دەکرێتەوە، گومان لەوەدا نیە کە ئەم چەوتی و چەواشەکارییە، هەم کەلێن و خەوشێکی مەزنە لە دیرۆك و هەم غەدرێکی گەورە و ناهەقییێکی تاڵە لە نەتەوە نا فارسەکان دەکرێت، دیارە هەژموونی نوسەران و ئەدیبانی فارس بەسەر مەعریفە و رۆشنبیریی ئیسلامیدا، هۆیەکی بنەڕەتیی ئەم شێواندنەیە.

وەك ئاشکرایە، لە شاهنامەی فیردەوسی و لە لای زۆربەی نوسەران و مێژوونوسانی سەردەمی ئیسلامی بە فارس و عەرەبەوە و بە لێکدانەوەیەکی تەواو ئەفسانەییەوە، شاه جەم- جەمشیدی نەوەی کیۆمەرسی پێشدادی داهێنەری نەورۆزە و ئەم جەژنە لە سەردەمی ئەودا پەیدابووە، ئەوەبوو کاتێك دەفری کەژاوەکەی لە بان پشتی دێوێکدا لە بڵندایی ئاسمانا دەفڕی و دەدرەوشایەوە، خەڵکەکەش بینیان و گوتیان ئەوە شید- تیشکی جەمە و ئەمە رۆژی نوێ- نەورۆزە و کردیان بە جەژن. پاساوی ئەم لێکچوونەش رەنگە ئەوە بێت کە هەموویان لە یەك کتێبی پەهلەوی وەریانگرتبێت و هەمان گێڕانەوەیان

لە یەکدی گواستبێتەوە[1].

عو مەری خەییام (م: ٥٢٦ك/١١٣٢ز) لە نەورۆزنامەکە یدا دەڵ ێت کیۆمەرسی یەکەم شاهی فارس، دەیویست مێژوویەك د یاری ب کات تا ببێتە رۆژێکی دیار و ناسراو و بکرێتە بنەمای رۆژمێری، کە زانییی خۆر لە یەکەم خولەکی ئەو رۆژەدا دەگا تە بورجی کارژۆ ڵە، مو بەزەکانی کۆکردەوە و فرمانی پێکردن ئەو رۆژە بکەنە بنەما[2].

ئەمجا بە روانینێ کی دنیابین یەوە لەم پر سەی کۆڵیوە تەوە و جەمشیدی بە داهێنەری نەورۆز داناوە، بەڵام هەوڵیداوە لێکدانەوەیەکی واقع یی دور لە ئەف سانە بۆ ئەم داهێنا نە ب کات و دەڵ ێت: دەم ێك جەمشید و ئێرانیەکان زانییان خۆر دوو سوڕانەوەی هە یە و یەکێکیان سێ سەد و شەست و پێنج روژ دەخاهێنێت و دوای ساڵێك لە هەمان کات و خولەکی هەمان رۆژدا دەگەڕێ تەوە جێ گای یە کەمی خۆی لە بورجی کارژۆڵە (برج الحمل)، جەمشید ناوی ئەو رۆژەی نا رۆژی نوێ-نەورۆز و کردیە جەژن، دواتر شاهەکانی دی چاویان لێکرد[3].

بەلای عەلیی کوڕی مەهدیی کیسرەوییەوە ـ سەدەی ٣ك/٩ز ـ کە

(١) تأريخ الطبري، ١٧٥/١، الشاهنامە، ص٢٣، دەربارەی ئەم بابەتە بڕوانە: رەزا دەشتی، نەورۆز و بۆنەکان لە گێڕانەوە، ل٢٩ـ ٣٤، رمضان رمضان متولى، عيد النوروز عند الفرس، ص٥٧ـ٧٠، نوروز والأزدهاك، ص١٥ـ١٧.

(٢) نوروز نامە، ص٢، رمضان رمضان متولى، عمر الخيام عالم الفلك و الرياضيات و كتابە نوروزنامە، ص٨٩.

(٣) نوروز نامە ،ص ٢، عمر الخيام عالم الفلك، ص٨٩. و بڕوانە: مسكويە، تجارب الأمم، ٥٣/١.

(الجاحظ: م٢٥٥ك/٨٦٩ن) لێی وەرگرتووە، شاهی ئێران کیاخوسرەوی کوڕی پەروێز جیهانی کوڕی ئەرفەخشدی کوڕی سامی کوڕی نوح، نەك جەمشید، نەورۆزی داهێناوە، چونکە ئەو بوو بنەمای شاهایەتی و دەسەڵاتداریی هێنایەکایەوە و زێڕ و زیو و کانزای دەرهێنا و ئامێری ئاسنینی دروستکرد و ئەسپ و دەواری چوارپێی دەستەمۆکرد و کۆشك و تەلاری بنیادنا و زێ و روبارەکانی هەڵکۆڵی و دوڕ و عەنبەر و بۆنوبەرامەی دۆزییەوە و لە رۆژی نەورۆزدا دەستەڵاتی شاهێتی گرتەدەست و وڵاتی ئێرانشەهری ئاوەدانکردەوە و پایەکانی دەستەڵاتی چەسپاند و هەزار و پەنجا ساڵ حوکمی کرد[1].

سەرەڕای ئەم لێکدانەوانە، هی دیی تەواو جیاواز هەن[2]، لەوانە: موبزـ مو بدێکی خوراسان سەرهەڵدانی نەورۆزی دەگەڕاندەوە بۆ سەردەمی ساسانی[3].

ئارسەر کریستنسن دەڵێت نەورۆز جەژنێکی بەهاریە و هەندێك تایبەتمەندیی جەژنی زاگمۆگی بابلیە کۆنەکانی پارستووە[4]، توێژەرێکی کوردیش چەند جار لە کتێبەکەیدا، ئەوە دووپات دەکاتەوە کە نەورۆز

(١) المحاسن والأضداد، ص٢٣٣ـ٢٣٤.

(٢) بروانە: الراغب الأصفهاني (ت: ٥٠٢هـ/١١٠٨م)، محاضرات الأدباء(بيروت: ١٤٢٠هـ)، ٥٩٣/٢ـ٥٩٤.

(٣) ابن الفقيه، البلدان، ص٢٦٧، ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٣٥٦/١.

(٤) ايران في عهد الساسانيين، ص١٦٢.

داهێنراوی سۆمەریەكانە و هەمان جەژنی زاگمۆكە و سۆمەریەكانە بەر لە كۆچیان بۆ خوارووی عێراق لە كوردستان یادیان كردۆتەوە[1].

لە راستیدا لە هەزارەی یەكەمی پێش زایین و لە چەند شارێكی عێراق و میزۆپۆتامیا دا، ئاهەنگی جەژنی ئەكیتۆ دەكرایەوە كە هەر جەژنی زاگمۆكە, لەوانەش شاری هەولێر و شوێنی ئاهەنگگێرانیش لە دەشتی ملكیە بوو[2] كە تا ئێستاش هەر بەو ناوەوە ناودەبرێت. ئەو بۆچوونەش هەیە كە ئەژدەهاك، وێنا و بەرجەستەكەری گركانێك بووە لە سەردەمی پێشدادی(٥٠٠٠_٤٠٠٠پ.ز)لە چیای سەركەشی دەماوەند رویداوە[3].

## ٢_٢_ سەرهەڵدانی نەورۆزی كوردەواری:

كەچی وەك هەموو دەزانین، نەورۆزی كوردەواری داهێنانی جەمشید و كیاخوسرەو نیە و پەیوەندیەكی وەهای بەو دوو شاهەوە نیە، بەڵكو رۆژی لەناوبردنی زوحاكی ستەمكار و بێداد و بنەبڕكردنی ناهەقی و زۆرداریيە و ئەو رۆژەیە كە كاوەی ئاسنگەر(؟) لەناو خەڵكی برسی و رەشورووت وستەملێكراو دەركەوت و دژی زوحاك راپەڕی و دەستەڵاتیی لەناوبرد و رادەستی فەرەیدونی كرد و فەرەیدونیش لە چیای دەماوەند كۆتیكرد و فڕێیدایە زیندانەوە و دواتر لەناوی برد.

---

(١) مەولود ئیبراهیم حەسەن، نەورۆزی كورد، ل١٣، ٢٨، ٤٣.

(٢) راجحة خضر النعيمي، الأعياد في بلاد وادي الرافدين، ص٨٦.

(٣) نوروز والأزدهاك، ص٩٥.

بە واتایەکی دی، پەیدابوونی نەورۆز لای فارس پەیوەستکراوە بە سیاسەت و دەوڵەتداری و جیهانگیری یەوە، کەچی لای کورد بەلای چەمکی دەربازبوون لە چنگ شاهێکی زۆردار شکاوەتەوە و جەخت لەسەر بەدیهاتنی سەربەستی و ئازادی و دادپەروەری و نەمانی نەهامەتی و ژێردەستی و ناهەقی و بێدادی کراوەتەوە، لە نەورۆزی کوردەواریدا سەرکەوتن و رزگاربوون و سەرفرازی، ئاوێزانی جوانی و دلگیری و نوێبوونەوە بوونە و ئاوێتەی یەکدی بوونە و جەژنێکیان بەرهەمهێناوە کە ناوەکەی پڕ بە پێستی خۆیەتی...نەورۆز.

ئێمە دڵنیاین لەوەی کە هاوتەریبی ئەو گێڕانەوە و لێکدانەوە کلاسیکیەی کەوا لە سەرچاوە پەهلەویەکاندا هاتووە و گوزارشت لە دید و بۆچوونی نەتەوەی فارسی سەردەستە و چینی دەستەڵاتداری ساسانی دەکات و سەرچاوە ئیسلامیەکانیش وەک خۆی وەریانگرتووە، لێکدانەوەیەکی دیی تەواو جیاواز لەنێو جەماوەری خەڵکی کوردستان لەئارادا بووە کە زیاتر لە واقیع و لە رووداوێکی راستەقینەوە نزیکە، ئەویش ئەوەیە کە فەرەیدون پاش شەش هەیڤ لە بەندکردن، زوحاکی کوشتووە و ئەو رۆژە کراوەتە جەژن و بەرۆژی نوێ ـ نەورۆز ناوزەدکراوە.

بە ئاخفتنێکی دی، نەورۆز لای کورد رۆژی کوشتن و لەناوبردنی یەکجارەکیی زوحاکە، ئەم لێکدانەوە کوردانەیەش وەنەبێت نوێ بێت و داهێنراوی هەستی نەتەوەیەتی و بزاڤی رزگاریخوازیی کورد بێت، بەڵکو کەونارە و هاودەمی ئەوەی فارس و ساسانیەکانە و ئەوەندەی من بزانم لە سێ سەرچاوەی کۆنی سەردەمی ئیسلامی باسکراوە، ئەوەتا(ابن

الفقيه: م٣٤٠ك/٩٥١ز) کە خەڵکی هەمەدانە و(ابوسعید النقاش: م٤١٤ك /١٠٢٣ز) ودوای ئەوانیش(ابن الأثیر: م٦٣٠ك/١٢٣٣ز)، دوو گێڕانەوەیان یاداشتکردوە ئەوە دەسەلمێنن کە جەژنی نەورۆز لە ئاکامی کوشتنی زوحاك و ئاگرکردنەوەی ئەو کەسانەی لە سەربڕین رزگاربوون پەیدابووە.

وەك دیاریشە بە کۆدەنگی سەرجەم هەواڵ و سەرچاوەکان، بە شاهنامەی فردەوسی و شەرەفنامەی بەدلیسیی خۆمانیشەوە، کورد ئەوەی رزگاربووانی تیغی ئەرمائیل وخوێنڕێژیی زوحاکن، ئەمەش پوختەی دوو گێڕانەوەکەیە:

"فەرەیدون پاش ئەوەی بەسەر زوحاکدا زاڵبوو و لە کێوی دەماوەند بەندی کرد و ئەم رۆژە کرایە جەژنی میهرگان- میهرەجان[1]، ئەمجا گازی ئەرمائیلی کرد کە وەزیری زوحاك وبەرپرسی سەربڕینی مرۆڤەکان بوو و هەر رۆژەو دوو کەسی سەردەبڕی و مێشکیانی دەرخواردی ئەو دوو مارە دەدا کە لەبان هەردوو شانی زوحاك رووابوون، و پێی راگەیاند :دەبێ سەرت ببڕم وەك چۆن تۆ خەڵکییت سەردەبڕی، ئەویش پاڕایەوە و گوتی: من رۆژانە لە دوو کەسەکە، تەنها یەکێکیانم سەردەبڕی و دووهەمیانم ئازاددەکرد و لەبریی بەرانێکم دەکوشتەوە.

ئەمجا فەرەیدون لێی پرسی: چۆن بڕوات پێ بکەم؟ ئەویش بردی بۆ ئەو شوێنەی کە کردبوویە دەرەتان و هەتوانی دەربازبووەکان و گوتی

(١) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی میهرگان بڕوانە: رەزا دەشتی، نەورۆز و بۆنەکان، ل١١٧-١٢١.

ئەمانەن، دەربازبووەکانیش لەسەر خواستی ئەرمائیل هەر یەکەو لە جێگای خۆیەوە ئاگری پێکرد تا بناسرێنەوە و فەرەیدون بزانێت ژمارەیان چەندە، فەرەیدونیش پاش ئەوەی بەچاوی خۆی دیتی کە ئەرمائیل چ دلۆڤانییەك و مەردایەتییەکی لەدەست هاتووە، لێی خۆشبوو و کردی بە شاهی دەربازبووەکان و مەملەکەتی دەماوەندیشی پێبەخشی، دواتر پاش شەش مانگ و لە رۆژی نەورۆزدا زوحاکی کوشت، میللەتانی عەجەم گوتیان ئەمڕۆ رۆژی نوێیە و نەورۆزە و کردیان بە جەژن[1].

بۆ بیرهێنانەوە و یادکردنەوەی ئاگری دەستەچیلەی دەست رزگاربووان لە باب و باپیرانی کورد، لەبان کێوی سەرکەشی دەما- دەماوەند و بە درێژایی هەزاران ساڵ، گشت شەوانی نەورۆز ئاگرێکی مەزن دادەگیرسێنرا و کە لە دوورەوە دەبریسکایەوە و دەوروبەری روناك دەکردەوە[2]، ئەوەی شایەنی ئاماژەیە ئەم یادکردنەوەیە لایەنی کەم تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە، ساڵانە لە رۆژی(٣١)ی ئاب[3] لە شوێنێکی سەر کێوی دەماوەند سازدەدرا و دەکرا بە جەژن، بەگوێرەی ئاخافتنی گەڕۆك جێمس مۆرییە(١٧٨٠-١٨٤٩) کە بەخۆی ئامادەی بووە، ئەم جەژنە بە جەژنی کورد یان پشووی کورد دەناسرا و بەبۆنەی

---

(١) كتاب البلدان، ص٥٥٢ـ ٥٥٤، فنون العجائب ، ص١١٤ـ ١١٥، الكامل في التأريخ، ٦٦/١.

(٢) البيروني، الآثارالباقية، ص٢٧٠.

(٣) ئەم رۆژە لە کتێبی: (نوروزوالأزدهاك) بە هەڵە بووە بە(٣١)ی مارت.

رزگاربوونی باوانی کوردەوە بوو لە دەستی زوحاک[1].

لە زنجیرە گوتارێکیشدا کە خەلیل خەیاڵی و مەمدوح سەلیم لە ژمارەکانی گۆڤاری (ژین) بڵاویان کردۆتەوە ـ ئەم گۆڤارەش لە ساڵانی ۱۹۱۸ـ۱۹۱۹ بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی لە ئەستەنبول دەردەچوو ـ نیسان رۆژی سەرکەوتنی کاوە بە رۆژی(۳۱)ی ئاب دەستنیشانکراوە و زۆر نزیکە ئەم زانیاریە هەر لە جیمس مۆرییەوە وەرگیرابێت.

لە شاهنامە و سەرچاوە دیرۆکیەکاندا، ئەوە بووەتە راستیەکی رەها، کە زوحاک راستەوخۆ پەیوەندیی بە کوردەوە هەیە و گوایە ئەو کەسانەی لە ئاکامی دلۆڤانیی وەزیرەکەی زوحاکەوە لە سەربڕین دەرباز بوون و نەبوونە خوراکی دوو مارەکەی بان هەردوو شانی، ئەوانەن باب و باپیری کورد[2]، بەمپێیە کورد لە هەر میللەتێکی دی پتر نزیکتر و پەیوەستترن بە زوحاکەوە، ئەم روداوە لەبەر مەزنی و کاریگەرییەکەی هاودەم و هاورۆژی سەرکەوتنی گەردوون و سروشت کراوە بە یەکسانبوونی شەو و رۆژ و نەمانی زستانی سارد وناخۆش و هاتنی بەهاری پڕ لە جوانی و قەشەنگی.

ئێمە وای بۆ دە چین کە زوحاک ـ ئەژدەها ـ ئەزی دها کە، هەر (ئە ساگۆ)ی سۆمەریە کە بەرجەستەکەری ئەو ترس و گەف و دوژمنایەتی یە بوو کە لە چیا بەرز و سەختەکانی کورد ستانەوە

---

(۲) James Morier, Second Journey through Persia,Armenia and Asia Minor, (1810-1816), p 357.

(۳) بڕوانە: العزيز، الجذور الأسطورية لملحمة نوروز، ص۲۱۰ـ۲۱۳.

سەرچاوەی دە گرت و دە بووە ما یەی نی گەرانی و د ڵەڕاوکێی مرۆ ڤی ولا تی سۆمەر و چارەنو سی خۆی و شار ستانیەتیەکەی دەخ ستە مەترسیەوە، وورد تر ب ڵێین هەر چیاکانی کورد ستان و گۆتی یەکانن، ئەساگۆی سۆمەرین و زوحاکی لەمەڕ نەورۆزن.

لە راستیدا مەرج و پێویستیەکانی بەرجەستکردنی ئادەمی و سروشتیی بیرۆکەی ستەمکار و زۆردارێکی وەك ئەساگۆ و زوحاك لە کوردستان هەبووە و گۆتییەکان لای سومەریەکان و ئەکەدیەکان و بابلیەکان، هاوچەشن و هاوڕەفتاری زوحاکی نێو ئەفسانەی نەورۆزن، هەروەها توانەوەی بەفری چیاکانی کوردستانیش هاوشێوەی زوحاك، گەف و هەڕەشە بوون بۆ دانیشتوان و ئاوەدانی و شارستانیەتی عێراقی کۆن .

هەروەها نەورۆز، سەرساڵی بەهاریی تایبەت بوو بە هەرێمەکانی باکوری ئێرانزەمین و بە کوردستانەوە کە شاخاوی بوون و کەش و ئاووهەوایی سارد و بەستەڵەك بوو و وەرزی زستانی دە مانگی ساڵی دەخایاند و هاتنی بەهار و بڕانەوەی وەرزی سەهۆڵبەند و گۆڕانی ئاووهەوا دەبووە سەرساڵ و جەژن بۆ دانیشتوانەکەی، بە پێچەوانەی هەرێمە گەرمەسێرەکانی باشور کە دەستپێکی ساردبوونی ساڵیان دەکرد بە سەرساڵ و جەژن و بە (نەوسەرد) دەناسرا و هەردوو وشەی (ساڵ) و (سارد) لە (سەریدە) وەرگیراون[1].

(١) هاشم رضی، جشن های آب، ص٣٤، عەبولعەزیم رەزایی، مێژوی نەورۆز و کرۆنۆلۆجیای ئێران، وەرگێڕانی شەریف فەلاح، ل١٥٥.

ئێمە لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، پێمانوایە کە مەبەست لە دێوی ئەساگ- ئەساگۆی سۆمەری و ئەکەدی هەر چیاکانی کوردستان و دانیشتوانەکەیەتی لە گۆتییەکان ولۆلۆییەکان و هەمان ئەژدیها- زوحاکەکەی لەمەڕ نەورۆزیشە.

بەسەرچوونی زستانی وەیشوومە و سەهۆڵبەند بەگشت زە حمەتی و ناخۆشیەکانیەوە و هاتنی بەهار بە گشت جوانی وخۆ شیەکانیەوە لە کات و رۆژی یەک سانبوونی شەو و رۆژ لەلا یەك و رز گاربوونی باب و باپیرانی کوردیش لە جەور وستەمی ئەژدیها- زوحاك لە هەمان کات و رۆژدا لە لایەکی دیەوە، واتا رێککەوتنی روداوێکی سروشتی و گەردوونی لە گەڵ روداوێ کی دنیایی- بەپێی ئەفسانەکە- کە هەردووکیان بە سەرکەوتنی خۆشی و هەق و داد پەروەری کۆتاهیان هات، بەڕاستی شایەنی ئەوە یە ناوبنرێ رۆژی نوێ- نەورۆز.

## ٢-١- لە سەرەتاوە تا سەردەمی ساسانی:

نەورۆز وەك لێکۆڵەرێکی کورد دەڵێت:" زاراوەیەکە لە کەلتوری گەلانی ئاری رەگەزدا چەسپاوە و مۆرکی جۆراوجۆری ئایینی، ئەفسانەو مێژوویی، جوگرافی، کۆمەڵایەتی، سیاسی و نەتەوەیی لای هەر یەکێك لەم گەلانە گرتۆتەخۆی. پەگشتی نەورۆز بابەت و بۆنەو کەلتور و رووداوێکی پیرۆزە. وشەکە لە واتای فەرهەنگیی خۆی زیاتر پەرەو فراوانی رۆیشتووە، واتای نوێبوونەوەکەی زۆر فراوانبوون، رۆژگارێکی تازە و نوێ، رۆژێکی خۆش و گەش و جوان، رۆژێکی پڕ جۆش و خرۆش ...، کۆتایی سەردەمێکی کۆنی ناخۆش و تارێك و ئەستەم و پڕ ستەمە، سەرەتای مێژوویەکی روناك، ئازادی و سەربەستییە.نەورۆز رۆژی گەیشتن بە ئاوات و جێبەجێکردنی داواکارییەکانە، رۆژی تازەبوونەوەی ژیان و بەرپاکردنی نوێییە، رۆژی پڕ خێر و بەرەکەت و فەرە، رۆژی رزگاربوون و سەرفرازییە، رۆژی هیوا و خواستن و جێبەجێکردنی مرازەکانە،... رۆژی ئاوات خواستنە بە کۆتایی ناخۆشی و رەشبینی و رۆژی چاکبوونەوە و رزگارییە لە دەستی خراپەکاری و هێزی شەڕ کە ئەهریمەنە... نەورۆز راستی و دروستییە، رووداو و مێژووە، ئاین و ئەفسانەیە، داستان و راپەڕینە، جوگرافی و گۆڕانی ئاووهەوایە، سەردەمێکی نوێیە"[١].

راستیەکی بەڵگەنەوێستە کە نەورۆز لە دێزەمانەوە لە ئەفسانەوە

(١) د.رەفیق شوانی، نەورۆز سەرەتای شارستانیەت، ل٨-٩.

بووە بە واقیع و باندۆر و شوێنەواری قوولی لە مێژوودا بەجێهێشتووە و هەر لە رۆژگاری دێرینەوە تا ئەمرۆ، نەخشی هەبووە لە رووداو و بەسەرهاتی مێژووی مرۆڤی وڵاتی ئێرانزەمین.

نەورۆز کۆنترین و ناودارترین و مەزنترین جەژنی نەتەوە و هۆزە ئێرانیەکانە، لەگەڵ ئەم راستیەشدا وەك فەکۆلەر و ئێراننناسی بەتوانا و شارەزا هاشم رەزی دەڵێت: "نە لە ئاڤێستا ئامازەی روون و راشکاو بەرچاو دەکەوێت و نە لە هەردوو سەردەمی ئەخمینی- هەخامنشی و ئەشکانی، بەڵگەی نوسراو دەست دەکەوێت سەبارەت بە یادکردنەوەی ئەم جەژنە(١)، تەنها ئەوەندە هەیە نەخش و نیگارەکانی سەر بەرد و کەڤرەکانی تەختی جەمشیدی پایتەختی هەخامەنشیەکان، ئەوەمان بۆ دەگێرنەوە کە لە دەستپێکی هەر ساڵێکی نوێی سەردەمی هەخامنشیدا ، رێورەسمی ئایینی دەگێردرا و ئاهەنگ سازدەکرا و شاهی هەخامنشی بەخۆی ئامادە دەبوو و نەتەوە و میللەتانی ژێر ئاڵای شاهانشا دیارییان دەهێنا و پێشکەشیان دەکرد، هەروەها لە بنیادنانی تەختی جەمشیدا، رەچاوی رۆژژمێری و ئەستیرەناسی کراوە و بەوردی شوێنی دەرکەوتنی تیشکی رۆژ لە کاتی بەرانبەریی بەهاری و پایزی دەستنیشان کراوە، لە راستیدا ئێرانیەکان ساڵانە لە سەردەمی هەخامەنشیدا و بەئامادەبوون و رێبەرایەتیی مۆغەکان، ئاهەنگ و کەژاوەی بەرفراوانیان لە تەختی جەمشید سازدەدا(٢).

---

(١) جشن های آب، ص٢٤.

(٢) جشن های آب، ص٢٥.

رۆژهەڵاتناسان: ئێردمان گریشمان و گرالد ڤالسەر، وای بۆ دەچن کە مەبەستی سەرەکی لە ناواکردنی تەختی جەمشید بەو شێوەیە یادکردنەوەی جەژنی نەورۆز بووە(1). هەروەها لە تلمودی بابلیدا کە لە سەدەی یەکەم و دووەمی زایینی نوسراوەتەوە و کۆکراوەتەوە، هاتووە کە ئێرانییەکان چوار جەژنیان هەیە: Turyaskaik ،Mutardi ، Maharnekaik ،Muhren، بە دیتنی توێژەری ئێرانی سەید حەسەنی تەقیزادە مەبەست لەم جەژنانە نەوسەرد و تیرەکان و میهرەگان و نەورۆزە(2).

ئەمەیش بۆچوونی هاشم رەزی یە دەربارەی بۆنەی نەورۆز لە سەردەمی هەخامنشی دا:

"ئایا بەردە هەڵکۆڵراوەکانی تەختی جەمشید وێنەی ساڵی نوێ و چۆنیەتی بەڕێوەچوون و مەراسیمی پێشکەشکردنی خەڵاتەکانی گەل و نەتەوە ملکەچەکان بۆ شاهەکانی ئێران پیشان نادەن، کە بنیادنانی تەختی جەمشیدیش بەپێی لێکدانەوە گەردوونی و ئەستێرەناسیەکان بووە کە لە ڕۆژگای وێنەکێشانی هەڵهاتنی خۆر لە هەردووکاتە هەڵگەڕانەوەکەی بەهار و پاییزدا (الإعتدالین) ئەم ڕاستیەمان بۆ دەسەلمێت.

(1) نوروز، بە کوشش علی دهباشی، ص٦٢٨.

(2) بیست مقال (تهران:١٣٤١هـ.ش)، ص٣٢، لە: کاظم عبد علي، النوروز مظهر من مظاهر التواصل بین العرب والفرس، رسالة ماجستیر، الجامعة الیسوعیة (بیروت: ١٩٧٥)، ص٦٩، وەرگیراوە.

ئەوەی لە میانەی توێژینەوەکاندا بۆمان دەردە کەوێت، ئەوە یە کە توێژەران لەم بارەیەوە یەکدەنگ نین. لە لا یەکی دیکە شەوە لە تا تە بەردەکان و نوسینی مێژوونوسان و پاشماوە شوێنەواریە کۆ نەکان و تا تە قورِ نە زۆرروزەبە ندە بەجێماوەکانی تەختی جەم شید، هیچ بەڵگەیەك بۆ شیکردنەوەی بەڵگەییانەی ئەم کارە لەبەردە ستدا نی یە. لەگەڵ ئەمانەشدا، کەسانی وەك نیلندەر[1] لەو باوەڕەدان کە ئەما نە پیشاندەری مەراسیمی پێشوازیی ساڵی نوێن، کە لە ڕێگای بەردە هەڵکۆڵراوەکا نەوە پێ شانی ئێ مە دەدر ێن، تەنا نەت ڕە ضەدکاری ئەستێرەناسانیش لە سەر شێوازی بنیاتنانی ئەم باڵەخا نە بڵندا نە ئەنجام دەدرا.

هەڵبەت ل ێرەدا، هیچ ئاماژە یەك بۆ بەڕێوە چوونی بۆنە یەك لە هەڵگەڕانەوەی بەهارە یان سەرەتای بەهار کە هەمان نەورۆزە نی یە، هیچ ئاماژەیەکیش بۆ هەڵگەڕانەوەی پاییزە کە هەمان میهرەگانە نییە، بەڵام ئە گەر ب ێت و ئەم لێکدا نەوە لاوازە قبوڵ کەین ئەوا دە بێ میهرە گان بە دە ستپێکی ساڵی نوێ لە سەردەمی پا شایەتی ئەخمینیەکان دابنێین.

لە توێژینەوەکانی بۆنەی سەری ساڵ و بۆ نەی بەهارەی ئەکیتۆ (Akitu) لە بابلدا، ئاماژە بە چەند لێکچوونێك لە نێوان نەورۆز و ئەم بۆنەیەدا کراوە، بەڵام ئەم هەڵکۆڵراوانە بە هیچ شێوەیەك لێکچوون و هاوشێوەبوونی هیچ یەکێك لەو بۆنانەمان بۆ دەرناخەن، تەنانەت ئەگەر

---

(١) لە کتێبی (أکتا ایرانیکا، جلد أول:١٩٧٤، ص١٣٨).

بێت و تیۆری وێکچوونی بۆنەی بەهارەی ئەکیتۆ یان هەمان نەورۆزی بابلی لە لای دانیشتوانی رۆژئاوای ئێران و ئەخمینیەکان بە راست بزانین ئەوا هێشتا هەڵکۆڵراوەکان هیچ شتێکمان لەم بارەیەوە بۆ پشتڕاست ناکەنەوە.

لێرەدا ئەگەری ئەوەیە هەیە، کە بە شێوەیەك لە شێوەکان لە رێگای تێکەڵبوون و کارلێکی دوولایەنەی کولتوری دانیشتوانی رۆژئاوای ئێران - پێش سەردەمی ئەخمینیەکان - لەگەڵ کولتوری بابلیدا، ئەم دانیشتوانە بۆنە بەهارینەکەی خۆیان بە نوسەرەد (نەوسەرەد، ساڵی نوێ) ناوناوە. هەروەك لە باسەکانی پێشووشدا ئاماژەمان پێکرد سەرەدە Sarada وشەیەکی ئاڤێستایی و سانسکریتیەو بە مانای ساڵ دێت، لە فارسی کۆنیشدا بە شێوەی Tharad(سەرەد) پێشچاو دەکەوێت، بەڵام ئەخمینیەکان و لەوانەشە دانیشتوانی رۆژئاوای ئێران پێش سەردەمی ئەخمینیەکان بۆنەی ساڵی نوێیان لە هەڵگەڕانەوەی پاییزەدا ئەنجامدابێت کە هەمان بۆنەی میترەکان یان میهرەگان بووە. ئەمەش هەمان ئەو دوو بۆنەیەیە، کە ساڵێکیان دەکرد بە دوو بەشەوە و لە نێو هیندیەکانیشدا پێشینەی هەبووە....

هاوکات لەگەڵ سەردەمی شاهێتی خەشایارشادا و بە ئیحتیمالی زۆر لە رێگای مۆغ گەلێکەوە، کە ئیلهامیان لە ئایینی زەردەشتیی رۆژهەڵاتی ئێران وەرگرتبوو، جۆرێك بزاڤی ئاینی هاتە ئاراوە، کە لەو بزاڤەدا ئاییزا سەرەکی و بەربڵاوەکانی ئێران وا تە: زەردە شتیگەری مەزدییەسنی، زەروانی(زەرڤانی)، میترایی و مۆغە چاکسازیخوازەکان (ریفۆرمخوازەکان) لە سەر گەلاڵەکردنی رۆژژمێرێك هاودەنگ بوون و

لێرە شدا هەر مانگێك رێك سی ڕۆژ بوو و هەر ڕۆژێکیش بە ناوی خوداوەندێ کەوە ناو دە نراو لە ناو نانی مانگەکانی شدا ناوە کانی ئەمشاسپەندان (کە ئەمشاسپەند بە مانای سیفەتی پاکی ئاهورا مەزدا ئێت و لە صیغەی کۆشدا بە مانای سیفەتە پاکەکانی ئاهورامەزدا ئێت) و مەهێن فەرشتەکان بەکار هاتوون. لەوانەیە لەم ڕێگەیەوە بوو بێت، کە بۆنەی سالّی نوێ لە هەلکەڕا نەوەی بەهارە و لە سەرەتای وەرزی بەهاردا چووبێتە ڕۆژ ئاوای ئ ێران و هاو شێوەی بۆ ئەی میترە کان ڕێوڕەسمی ئەو بۆنەیەی لە ناو خۆیدا جیێ کردبێتەوە.

گریمانەی ئەوە لە ئارادایە، کە لەم ڕێگایەوە بۆنەی سەری سالّ لە هەلگەڕانەوەی بەهارەدا چووبێتە ناو ڕۆژئاوای ئێرانەوە و وەکو میترەکان مەراسیم و دابونەریتەکانی لە خۆیدا جێکردبێتەوە، نمونەی ئەو ڕێوڕەسمانەش وەکو بەخشینی خەلات بە شاهەکان و ئەنجامدانی مەراسیمی باجدان لەلایەن ولاتانی ژێردەستەوە، کە هەلکۆلراوەکانی تەختی جەمشید پیشاندەری ئەمانەن. هەرچەندە ناتوانین بەلگەیەکی یەکلاکەرەوە بۆ مەراسیمی بۆنەی سەری سالّ لە سەرەتای بەهار لە سەردەمی دەسەلاتداریەتی ئەخمینیەکاندا بخەینە ڕوو، بەلام ئەگەر پشت بە نوسینەکانی مێژوونوسە بیانیەکان ببەستین، کە لە بارەی ئێرانی سەردەمی نوێ و پارتەکانەوە نوسیویانە لەوانەیە قبولّی ئەوەن بکەین کە بۆنەی سالّی نەورۆز لە سەرەتای بەهاردا ئەنجامدراوە"(١).

(١) جشن های آب، ص٢٥_٢٧، هاوڕێی بەڕێزم: م. سۆران بەهاء هەورامی بە سوپاسەوە ئەم برگانەی بۆ وەرگێرام.

## ٣-٢- لە سەردەمی ساسانی(٢٣٦-٦٥١ن):

ساسانیەکان هەرچەند دانیشتووی بەشی باشور و گەرمەسێری ئێرانن کە سەرساڵیان نەوسەرد بوو نەك نەورۆز، بەڵام چونکە لە بڕوادارانی ئایینی زەرادەشتی بوون، لەجیاتی میهرەجان، نەورۆزیان بە سەری ساڵ دادەنا[1].

نەورۆز هەر لە دەستپێکی سەردەمی ساسانیەوە تەواو ناسراوە و بە فەرمی و لە ئاستێکی بەرزدا یاددەکرایەوە و لە سەرانسەری وڵات بە کوردستانەوە دەکرا بە جەژن، پەیڤی نەورۆزیش لە دەقە پەهلەویەکانی ئەو سەردەمە بە شێوەکانی: نۆکروچ، نوگرۆچ، نەورۆچ، نەورۆژ هاتووە، بەلای کەمەوە تا پاش دوو سەدەش لە دەرکەوتنی ئیسلام، شوێنەواری ئەم ناوانە هەر مابوو، لە دوو بەیتی شاعیر ئەبو نەواس پەیڤی نەورۆز، بە نوکروز هاتووە[2].

لە چەند کتێبکی پەهلەوی کە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی ساسانی و سەرەتای سەردەمی ئیسلامی وەك کتێبی(تاجنامك) و کتێبی (بوندەهشن) و کتێبی (دینکەرد)، ئاماژە بە جەژنی نەورۆز دراوە و

(١) هاشم رضی، جشن های آب، ص٣٤، عەبدولعەزیم رەزایی، مێژوی نەورۆز و کرۆنۆلۆجیای ئێران، ل١٥٦.

(٢) الصیاد، النوروز وأثره في الأدب العربي، ص١٣-١٤، جشن های آب، ص٩٥، مزوري، نوروز والأزدهاك، ص١٠-١١...

**جەخت لەسەر مەزنی و پیرۆزی و خێروبێری کراوەتەوە[1].**

**تا رادەیەك زانیاری زۆرە دەربارەی نەورۆزی سەردەمی ساسانیەکان کە شەش رۆژی دەخایاند[2]، بەڵام سەرلەبەری پەیوەستە بە شاه و چینی دەسەڵاتدارەوە، نەك جەماوەری خەڵکی سادە و رەشۆکی و هیچ هەواڵێکمان دەستنەکەوت ئاماژە بکات بە نەورۆزی کوردستان.**

**سەرچاوە ئیسلامیەکانیش، لە وێنەی(الجاحظ: م٢٥٥ك/٨٦٩ز) لە هەردوو کتێبی (التاج في أخلاق الملوك) و (المحاسن والأضداد) و بەیرونی (م: ٤٤٠ك/١٠٤٨ز)، لە کتێبی(الآثار الباقية)و حکیم عومەری خەییام لە نەورۆزنامەکە یدا و چەندین سەر چاوەی دی، بەوردی ئا خافتوون سەبارەت بە رێورەسمی ئاهەنگێران و یادکردنەوەی نەورۆز لە لایەن شاهانی ساسانیەوە.**

**نەورۆز گەورەترین جەژنی میللی و نیشتمانی بوو و شاهانی ساسانی بە رەنگێکی فراوان یادیان دەکردەوە و لەودەمەدا نەورۆزی تایبەت و نەورۆزی گشتی هەبوو، یەکەمیان تایبەت بوو بە شاه و گەورە بەرپرسانی دەوڵەت، پاشان نەورۆزی گشتی کە هی سەرجەم خەڵکی مەملەکەتی ساسانی بوو[3].**

---

(١) بڕوانە: محمد معين، جشن نوروز، مجله جهان نو، سال أول، شماره أول، (خرداد١٣٢٥هـ.ش)، مزورى، نوروز والأزدهاك، ص١٠،١٤.

(٢) البيروني، الآثار الباقية، ص٢٧٥.

(٣) كريستنسن، إيران في عهد الساسانيين، ص١٦٢-١٦٣.

لە نەورۆزی تایبەتدا، شاە لە کۆشك دادەنیشت و پێشوازیی لە میوانان و گەورە بەپرسان دەکرد کە دەبوو وەك ئەرکێکی سەرشانیان بە شرینی و دیاریی بەنرخ و ناوازەوە بهێنە خزمەتی و هەرکەسە بەگوێرەی جۆری کار و پلەوپایەیی، توێژی شاسواران وەك نموونە دەبوو ئەسپێك یان شیرێك یان رمێك بکەنە دیاریی دەستیان[1].

پاش پێشوازی لە سالّی نوێ، دەستدەکرا بە گردکردنەوەی باجی ملّکانە و دامەزراندن و گۆرینی والی و مەرزەبانی هەرێمەکان و لێدانی دراوی نوێ لە دینار و درهەم و خۆشکردنی ئاگری ئاگرخانەکان و ئەنجامدانی رێورەسمی ئاگرکردنەوە لە دەمەو ئێوارەدا و ئاو پرژاندن لە سپێدەی رۆژی داهاتوو[2]، هەروەها خەلّکی مالّەکانیان پاکدەکردەوە و کەلوپەلی ناومالّیان دەگۆری، شاهەکانیش دەردەچوون بۆ راووشکار و نێچیرڤانی و جۆرەها خواردن و خواردنەوەیان بۆ ئامادەدەکرا[3].

هەر بە بۆنەی نەورۆزەوە، شاهەکانی ساسانی دیاریی نەورۆزیان وەك سەرانە- الجزیة- سەپاندبوو بەسەر هۆزی تەغلوبی عەرە بدا کە چوویبوونە سەر ئایینی مەسیحی، لەمبارەیەوە شاعیر جەریر(م:١١٠ ك/٧٢٨ز) لەمیانەی هێرشکردنە سەر شاعیر (الأخطل: م٩٠ك/٧٠٨ز) کە لە هۆزی تەغلوب بوو، دەلّێت:

(١) التاج في أخلاق الملوك، ص١٤٥ـ ١٤٦.

(٢) المصدر نفسه، ص١٤٦ـ١٤٧.

(٣) عمر خيام، نوروزنامه، ص١٥ـ٤٣.

تمنتْ خنازيرُ الجزيرةِ حربنا ........

........ وَقَدْ حَجَرَتْ من زَأْرِ لَيثٍ كلابُهَا ....

عَجِبْتُ لفَخْرِ التَّغْلِبّي وتَغْلِبُ ........

........ تؤدى جزى النيروز خضعاً رقابها ....

أيفخرُ عبدٌ أمهُ تغلبيةٌ قَدِ ........

........ أخضَرٌ من أكلِ الخنانيصِ نابُهَا[1].

---

(١) ديوان جرير، ص٥٦.

## ٤ـ١ـ نەورۆز وەك رۆژێکی ناسراو:

وەنەبێت نەورۆز ناوێکی نامۆ بێت لە مەعریفەی مێژوویی و ئەدەبیاتی ئیسلامیدا، بەڵکو تەواو ناسراوە، وەلێ دەنگوباس و زانیارییەکان لەمەڕ ئەم رۆژە، زۆر و بۆرە و بە ژمارە و قەبارە زۆرن و بە ناوەڕۆك کەمن و دووبارەکردنەوەن و زیاتر دەربارەی شاجەمشیدی پێشدادی و چۆنێتی سەرهەڵدانی نەورۆزن لە سەردەمی ئەودا و بوونی بەجەژنێکی گەل و نەتەوەکانی ئێرانزەمین، وێڕای گێڕانەوەی چەردەیەك بەسەرهاتی ئەفسانەئامێز.

لە دیوانی شاعیرانی فارس و عەرەبیشدا[1]، ژمارەیەکی زۆر شیعر هەن سەبارەت بە بەخێرهێنانی نەورۆز و بەهار و دەربڕینی دڵبەندی و بەختەوەری خۆیان و ستایشکردن و پیاهەڵدانی خەلیفە و چینی دەسەڵاتدار لە سوڵتان و میر و وەزیر و گەورە فەرمانبەران، بەڵام بەوپێیەی وشەی نەورۆز لەسەر کێشی(فوعول)ە کە لە زمانی عەرەبی نیە یان دەگمەنە، بۆیە عەرەب دەیانکرد بە(النیروز) لەسەر کێشی (فیعول)، هەرچەند هاوکات (النوروز) یش لە بەکارهێنان نەکەوت، بۆ روونکردنەوەی ئەم پرسە، زمانەوانی ناسراو (ابن فارس: م٣٩٥ك/١٠٠٤ز)

---

(١) لە شیعری شاعیران: (ابن الرومي:م٢٨٣ك/٨٩٦ز) و مهیاری دەیلەمی (م:٤٢٨ك/١٠٣٧ز) و (الشریف الرضي: م٤٠٦ك/ ١٠١٥ز) زیاد لە شاعیرانی دی باسی نەورۆز کراوە.

ناميلكەيەكی داناوه[1].

لە دە ستپێكی سەردەمانی فەرمانڕەوايی و بالأدە ستيی عەرە بە موسڵمانەكان و هەر لە رۆژگاری خودی پێغەمبەر محە مەدەوە(ص)، نەورۆز چ وەك پەيڤێكی ديار و چ وەك رۆژێكی پيرۆز و شاييبەخش، نەك هەر ناو و ناووبانگ و باسوخواسی لەدەست نەدا، بەڵكو بوون و ئامادەيی بەهێزی خۆی پارا ست، تەنا نەت گوا يە پێغەمبەر(ص) بە فەرمودە ستايش و پەسندی كردووە[2].

دەنگۆی ئەوەش هەيە كە كاتێك زانيويەتی خەڵكی مەدينە دوو رۆژيان هەيە بۆ ياری و كات بە سەربردن، هەردوو جەژنی رە مەزان و قوربانی هێناوەتە ئاراوە تا لەبری ئەو دوو رۆژە نائيسلاميە، خەڵكی مەدينە و دوا تريش ئو مەتی نوێی مو سڵمان ئا هەنگی تێدا بگێرن و گوزارشت لە كەيف و خۆشيی خۆيان بكەن[3]، بە بۆچوونی شهاب الدين مەحمودی ئالو سی(م:١٨٥٤)، مەبە ست لەو دوو رۆژە نەورۆز و ميهرەجانە، بەهەر حاڵ لە دەستپێكی دەركەوتنی ئايينی ئيسلامەوە،

---

(١) نوادر المخطوطات، تحقيق عبدالسلام هارون، ٢/٢٣-٣٠.

(٢) جشن های آب، ص٦٢، نوروز، به كوشش علی دهباشی، ص ٩٢٩.

(٣) عَنْ أَنَسٍ قَالَ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (ص) الْمَدِينَةَ وَلَهُمْ يَوْمَانِ يَلْعَبُونَ فِيهِمَا فَقَالَ : مَا هَذَانِ الْيَوْمَانِ. قَالُوا :كُنَّا نَلْعَبُ فِيهِمَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ص): إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَبْدَلَكُمْ بِهِمَا خَيْرًا مِنْهُمَا يَوْمَ الأَضْحَى وَيَوْمَ الْفِطْرِ، أبي داود السجستاني، سنن أبي داود، ١/٤٤١. ناصر الدينی ئەلبانييش پەسند و پشتڕاستی ئەم فەرموودەيە ی كردووە.

نەورۆز بە تایبەت لە شاری مەدینە نامۆ نەبووە[1].

لە ئالیەکی دیبیەوە، نەورۆز بەهۆی ئەوەی واتای رۆژێکی پڕ لە خۆشی و شادی و کامەرانی و جوانی و خۆڕازاندنەوە دەبەخشێت و کۆکەرەوەی ئەم مانایانەیە و هاتنی واتای زاڵبوونە بەسەر بەستەڵەک و ساردوسڕیی سروشتدا و سەرکەوتنە بەسەر مرۆڤی دوژمن و ستەمکار دا، بۆیە لە لایەن راڤەکارانەوە(المفسرون)، هەوڵدراوە لە قورئاندا جێگای بۆ بکرێتەوە، یان لایەنی کەم شوێنەواری بۆ پەیدا بکرێت، لە میانەی لێکدانەوەی ئایەتی :(قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ الزِّينَةِ وَأَنْ يُحْشَرَ النَّاسُ ضُحًى) [2]، راڤەکاران خوێندەوەی جیاجیان بۆ (یوم الزینة) کردووە و زۆربەیان وای بۆ دەچن کە مەبەستی قورئان رۆژی جەژنە، مقاتلی کوڕی سلێمانی بەلخی (م: ١٥٠ك/١٦٧ز) و دەیان راڤەکاری دی، پێیان وا بوو مەبەستی قورئان لەم رۆژە جەژنی نەورۆزە[3]. لە چاخەکی رۆژهەڵاتی ئیسلامیشدا، نەورۆز ناسنا و رۆشنا بوو لای خەڵکی و هەندەناشکراو ناسراوبوو، مێژووی بە سەرهات و رووداوی پێ دیاری

---

(١) ابن أبي شيبة، المصنف في الأحاديث والآثار(مصنف ابن أبي شيبة)، ٣٤١/٤، ابن عساكر، تأريخ دمشق، ٢٦١/٢٢-٢٦٢.

(٢) سورة طه، الآية (٥٩).

(٣) الزمخشري، الكشاف عن حقائق التنزيل، ٧٣/٣، القرطبي، الجامع لأحكام القران،٢١٣/١١، تأريخ دمشق، ٦٥/٦١. پیرەمێردیش چەند جارێك دووپاتی دەکاتەوە کە ئایەتی: (اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا )، سورة الحديد، الآية (١٧)، ئاماژەیە بۆ رۆژی نەورۆز.

دە کرا[١] و پ شوو بە سوپا دەدرا و بڵاوە یان پ ێدەکرا[٢] و دەزا نرا دەکەوێتە کام رۆژی ساڵەوە[٣] و حەمزەی ئەصپەهانی(م: ٣٦٠ك/٩٧١ز) لە کتێبەکەی( تأريخ سني ملوك الأرض والأنبياء)دا، ساڵانە ئەو رۆژانەی دەستنیشان کردووە کە دەکەوتنە نەورۆزەوە. هەروەها بە شیعر موژدەی هاتنی رادەگەهێندرا و گوزارشت لە بەخێرهێنانی دە کرا[٤] و هەر بە شیعری پیاهە ڵدانیش پیرۆزبایی لە حاکم و بەرپرسانی وڵات دەکرا[٥]، جاری واش هەبوو نەورۆزانە دەکرایە دەلیڤەیەك بۆ لەناوبردنی کەسی نەیار و شرینیی ژەهراویکراوی دەرخوارد دەدرا[٦].

هاوکات رۆژێکی پیرۆزیش بوو، کە لە صۆفی جونەیدی بەغدادی نەهاوەندی (م: ٢٩٨ك/٩١١ز) لە گیانەلادا بوو، لە رۆژی نەورۆزدا کە دەکەوتە رۆژی هەیزیەوە قور نانی دەخوێند[٧] و زانای مەو سوعی ئەبورەیحانی بەیرونی (م: ٤٤٠ك/١٠٤٨ز) بەردەوام سەرقاڵی نوسین و داهێنان بوو و تەنها لە رۆژانی نەورۆز و میهرەجاندا پشووی دەدا[٨].

---

(١) الثعالبي، يتيمة الدهر، ١٣٦/٤، مسكويه، تجارب الأمم، ٣/ ٢٠٦، ١٨٩/٤، الكامل في التأريخ، ٤٣٩/٥.

(٢) النويري، نهاية الارب، ١٧٠/٢٦.

(٣) الكامل في التأريخ، ٥٤٥/٥، ٦٨٦،...هتد.

(٤) يتيمة الدهر، ١٣٨/٥، ١٧٠، ٢٠٤.

(٥) يتيمة الدهر، ١٨٢/١، ٢/ ٣٨٠، ٣/ ٧٧، ابن الشعار، قلائد الجمان، ٢١/٦، ٢٥٧/٨.

(٦) تأريخ الطبري، ١٨٤/٩، الكامل في التأريخ، ٥٣٢/٥.

(٧) الخطيب البغدادي، تأريخ بغداد، ١٦٨/٨.

(٨) الصفدي، الوافي بالوفيات، ٩٢/٨.

## ٤-٢- وەرگرتنی دیاری نەورۆزانە:

دەکرێت بڵێین وەك چاولێکرنێك لە شاهە ساسانیەکان، دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایانی دەوڵەت و میرنشینەکانی جیهانی ئیسلامی زیاد لە هەر شتێکی دی، نەورۆزیان دەکردە بۆنەیەك بۆ زیاتر روتاندنەوەی رەعیەت و هەلێکی لەبار بۆ وەرگرتنی شیرینی و دیاریی ناوازە و دەستخستنی شتومەك و کەلوپەلی پرپەها، شاعیران و فەرمانبەران و خەڵکانی هەلپەرستیش لە لای خۆیانەوە، فرسەتی نەورۆزیان لەدەست نادا بۆ خۆ نزیکخستنەوە لە خەلیفە و شاهان و گەورە بەرپرسان، لە پێناو سەلماندنی بەندەیی و گوێڕایەڵیی خۆیان و وەرگرتنی پۆست و پارە و ئیمتیازات، ئەم دیاردەیەش هەر لە کۆنەوە نەریتێکی باو بووە:

هذا يومُ جَرت فيهِ العادة بألطافِ إتحافِ العَبيد السادة [1].

واتە لەم رۆژەدا وا باوە بەندەکان دیاری بدەنە خاوەندەکانیان. ئەم دیارییانە هەمەجۆر و هەمەچەشن بوون، لە خواردن و خواردنەوە وەك گندۆرەی کافور، شۆربا، حەلوا[2]، یان داهێنانێکی زانستی[3]، یان کتێب و نامیلکە و قەصیدەی شیعری[4]، یان لەبری باجی نەورۆزانە کتێب

---

(١) ابوهلال العسكري، الأوائل، ص٣٤٨.

(٢) الثعالبي، يتيمة الدهر، ١/٤٨٠، ٢/٣٢٤، الكامل في التأريخ، ٥/٥٣٣.

(٣) يتيمة الدهر، ٢/٣٣١.

(٤) الأصفهاني، الأغاني، ٢٠/٣٧، نوادر المخطوطات، ٢/٣٥.

دەکردرایە دیاری[1]، یان هەر شتێکی بەنرخ و گرانبەها و ناوازەوەك: ئەسپ، شیر و چەك، جلوبەرگ و پۆ شاك، بۆنوبەرا مە، خشڵ و زێڕ و زیو...هتد[2].

سەبارەت بە حەڵاڵی و حەرامیی نەورۆزانەش، بۆچوون و لێکدانەوەی جیاواز هەن، فەقیهێك پێیوایە، ئەگەر دیارییەکە میوە بێت وەربگیرێت و ئەگەر شتێکی دی بێت رەتبکرێتەوە[3].

ئەوەی لە سەرچاوەگەلێك دووپاتکراوەتەوە ئەوەیە کە ئیمام عەلیی کوڕی ئەبوتالیب لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتاب(١٣ـ٢٣ك/٦٣٤ـ٦٤٥ز)، یەکەم کەسی موسڵمانە بە بۆنەی نەورۆزەوە دیاریی وەرگرتووە و دەڵێن کاتێك حەلوا یان پالوودەی پێشکەش کراوە، گوتوویەتی: بە چ بۆنەیە کەوە ئەم خوارد نەم پێشکە شدەکەن؟، ئەوانیش پێیان گوتووە بە بۆنەی نەورۆزەوە یە، ئەویش فەرموویەتی هەموو رۆژێکمان هەر نەورۆز بێت[4] بانگخوازی ناسراوی شیعەی ئیسماعیلی قازی نوعمان (القاضي النعمان: م٣٦٣ك/٩٧٤ز) دەگێڕتەوە کە پێغەمبەر(ص) یان ئیمامی عەلی فەرموویەتی: چەند پێتان کرا رۆژانە

(١) قلائد الجمان، ٢٥٢/٧.

(٢) الجاحظ، المحاسن والأضداد، ص٢٣٩ـ٢٤٠، المسعودي، مروج الذهب، ٣٠٠/٢، التنوخي، نشوار المحاضرة، ٢٤٦/٨، ابوهلال العسكري، الأوائل،ص٣٤٧، تجارب الأمم،١٨٢/٥،٢٢٥.

(٣) مصنف ابن أبي شيبة، ١٢٦/٥، ٤٣٢/٦.

(٤) الجاحظ، التاج في أخلاق الملوك، ص٢٨١.

بیکەنە نەورۆز[1].

هەروەها والی و گەورە فەرمانڕەواکانی دەوڵەتی ئیسلامی، ڕۆژی نەورۆزیان بە هەل دەزانی بۆ زیاتر چەوساندنەوەی خەڵکی و وەرگرتنی دیاری لێیان،ئەم دیاردەیەش لایەنی کەم لە سەردەمی سێهەم خەلیفەی ڕاشدی عوسمانی کوڕی عەففان (٢٤ـ ٣٥ك/٦٤٥ـ ٦٥٥ز) دەستی پێکرد، ئەبوبەکری صولی(م: ٣٣٥ك/٩٤٧ز)دەڵێت:

"یەکەم کەس وەرگرتنی دیاریی نەورۆز و میهرەجانی کردە نەریت، والی (الولید بن عقبة بن أبي معيط) بوو، پاشان والی(سعيد بن العاص)، خەڵکی لەبەر بڵندیی ڕێژەی ئەو دراوەی بە بیانووی دیارییەوە لێیان دەستێندرا کە دەگەیشتە دەیان ملیۆن دینار، هاوار و سکاڵایان برد بۆ خەلیفە عوسمان، ئەویش بەدەنگیانەوە هات و ڕێگریی کرد لە دیاری وەرگرتن"[2].

ئەم هەڵوێستەی خەلیفە عوسمان نەبووە مایەی ڕاگرتنی دیاردەی دیاری و بەرتیل وەرگرتن، بەڵکو پتر تەشەنەی کرد و ڕێژەی دیارییەکانیش بڵندتر بوونەوە، نەخاسمە لە سەردەمی دەسەڵاتی ئومەوییەکان (٤٠ـ ١٣٢ك/٦٦٠ـ٧٤٩ز) کە هەرگیز گوێیان بە حەرامی و حەڵاڵیی داهات و شەرعی و ناشەرعیی سەرچاوەکەیی نادا و هیچ کۆڵیان لە وەرگرتنی دیاری نەورۆز و میهرەجان ناکردەوە، لە ناکامی شەڕی

---

(١) أنه أهدي إليه فالوذج، فقال: ما هذا؟ قالوا: يوم نيروز، قال: فنيرزوا إن قدرتم كل يوم، يعني تهادوا وتواصلوا في الله. دعائم الاسلام، ٣٢٦/٢.

(٢) أدب الكاتب، ص٢٢٠.

بەردەوامی ئومەوییەکان لەگەڵ نەیارەکانیان لە شیعە و شوراتەکان (الشراة ـ الخوارج) و بزاڤی عەبدوڵای کوڕی زوبێر و چەندین بزاڤی نەیاری دی، هەرکاتێك پێویستییان بە پارە و دراو هەبوایە بۆ خەرجیی شەڕ و دابینکردنی کەلوپەلی پێویست، بەتۆبزی باجی ناشەرعییان دەسەپاند، بۆ نموونە تەنها دیاریی نەورۆز و میهرەجانی رەشەخاکی عێراق لە سەردەمی یەکەم خەلیفەی ئومەوی معاویەی کوڕی ئەبوسفیان گەهیشتە دە ملیۆن دینار[1]، بە گوێرەی هەواڵێکی دی، بڕی پارەی ئەم دیارییانە دەگەهیشتە پەنجا ملیۆن دینار[2] و کاتێك حەجاجی کوڕی یوسف بووە والیی عێراق، باج و دیاریی نەورۆز و میهرەجانی کردە دووهەندە[3].

وەرگرتنی نەورۆزانە لە سەردەمی خەلیفەکانی ئومەوی درێژەی کێشا، تا خەلیفە عومەری کوڕی عبد العزیز(٩٩ـ ١٠١ك/٧١٨ـ ٧٢٠ز) کە ئەم دیاری و باجانەی لەکن ناپەسەند و ناڕەوا بوو، بڕیاری راوەستاندنی ئەو داهاتانەی دا کە لە بنەوانەی ناشەرعیەوە سەرچاوەیان گرتووە و لە نوسراوێکیدا بۆ یەکێك لە والیەکانی، داوای لێکردووە کە چیدی دیاریی نەورۆز و میهرەجان وەرنەگیرێت[4].

---

(١) تأريخ اليعقوبي، ٢/١٥٢، الجهشياري، الوزراء والكتاب، ص٢٤، تجارب الأمم، ٢/٢٢.

(٢) الصولي، أدب الكاتب، ص٢١٩.

(٣) أدب الكاتب، ص٢١٩ـ٢٢٠.

(٤) مصنف ابن ابي شيبة، ١٢/٢٦٠، تأريخ الطبري، ٦/٥٦٩، ابن قيم الجوزية، أحكام أهل الذمة، ١/١٤٥.

ئەم بڕیارەی خەلیفە عومەری کوڕی عبد العزیزیش ئەوەندە بڕی نەکرد و هەر دوای خۆی پشتگوێ خرا و سەر لەنوێ نەورۆزا نە وەردەگیرایەوە.

لە سەردەمی عەباسیی یەکەم و دووەم(١٣٢_٣٣٤ك/٧٤٩_٩٤٦ز)دا، خەلیفە و دەسەڵاتدارانی عەباسی هاو شێوەی ئومەوییەکان ڕۆژی نەورۆزیان بە دەلیفە دەزانی بۆ وەرگرتنی دیاری و لەم ڕۆژەدا هەموو جۆرە دیارییەك دەبەخشرایە خەلیفە و سەرکردە سەربازییەکان و بەرپرسە باڵاکانی دەوڵەت، لە مەی و شەراب و خواردنەوەی دی و شیرینی و خواردنی ناوازە و بۆنوبەرامە و هەنگوین و جل و پۆشاکی گرانبەها، لە سەرچاوە مێژوویی و ئەدەبییەکان و لە دیوانی شاعیراندا، دەیان بەڵگە هەن ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن.

شاعیرانیش بۆ خۆبردنە پێشەوە و خۆ خۆشەویستکردن لەکن دەسەڵاتداران، بەردەوام بە شیعر و قەصیدە ستایشی گەورە بەرپرسان و ساماندارانیان دەکرد، هاوکات شاعیری واش هەبوو هاتنی ڕۆژی نەورۆز و خۆشبوونی کەش و سازگاریی ئاووهەوا و جوانی و قەشەنگیی سروشت و پشکوتنی جۆرەها گوڵ و ڕەنگاوڕەنگبوونی خاك، دەیوروژاندن و دەیبزواندن و بە شیعری بەرز و نازك گوزارەشتیان لە ناخیان دەکرد، شاعیری واهەبوو لە وەصفی نەورۆز و خەمڵینی بەهار و دەربڕینی دڵشادی و ئاسودەیی خۆیدا، ڕەوانبێژیی کردووە و وێنەی

شیعریی بەرز و لێکچواندنی جوانی هێناوەتەوە و شاکاری داهێناوە[1] و دەکرێت بڵێین دەگمەن شاعیری فارس هە یە کە شیعری بە نەورۆز نەگوتبێت.

سەبارەت بە ستایشی میرە کوردەکان لە لا یەن شاعیرانەوە، تەنها ئەوە ندە دەزا نین کە قەترانی تەبریزی(م: ٤٦٥ك/١٠٧٢ز) شاعیری دیوەخانی میرە رەوادییەکانی ئازەربیجان، چەند قە صیدەییێکی بە بۆنەی نەورۆزەوە دا ناوە لە پە سن و پیاهە ڵدانی میرا نی شەدادی و رەوادی[2].

ئەوەش بڵێین کە نەورۆز بەو هەموو خۆ شی و پیرۆزیی خۆ یەوە، نەیتوانی ببێتە بەربەست و رێگر لەبەردەم میرانی ئاخرشەڕی کورد لە وێنەی میرانی هەکاری و ناچاریان بکات هەر چ نەبێت لەو رۆژەدا دەست لە دژا یەتی و کو شتوبڕی یە کدی هەڵگرن، لە نەورۆزی ساڵی١٥٨٨ز زەکر یا بەگی کوڕی زەی نەڵ بەگی هەکاری، لەبریی لێ بوردەیی و بەخ شندەیی، زاه ید بەگی برای خ ستەداوەوە و کو شتی، نو سەری دیوەخانی میرانی هەکاری تومر خانی یازجی (م: ١٠٤٤ك /١٦٣٤ز)، ئەم رووداوەی بە شیعر یاداشت کردووە:

عجب ساعت خوب و فیروز بود

(١) بۆ نموونە بڕوانە: محمد أمین رشید، النوروز في الأدب الفارسي، ص٢٣٣ـ٣١١، نوروز، به كوشش علی دهباشی، ص١٠٤٧ـ١٠٥٦، وصفی حسن، عید نوروز في الشعر العربي، مطبعة الخاني (دهوك: ٢٠١٢).

(٢) أحمد كسروی، شهریاران گمنام، ص٢٧٩ـ٢٨١.

محقق کە آنروز نوروز بود[1].

بەدەر لە دەسەڵاتداران، لەنێو چینی گشتییش(العامة) بەخشینی دیاری و شرینی نەریتێکی نەورۆزانە بوو، زانا و حەکیم (ابن سینا:م٤٢٨ ك/١٠٣٧ز) لە پێشەکیی نامیلکەی(الرسالة النیروزیة) کە وەك دیاریی پێشکەشی میرێکی کردووە بە ناوی ئەبوبەکر محەمەدی کوڕی عەبدولا، ناڕاستەخۆ ئاماژەی بە راستیەك داوە، کاتێك بۆ میری ناوبراو دەنوسێت و پێی دەڵێت منیش ئارەزووم کرد یەکێك بم لە میلەت و چاوم لە جەماوەری خەڵکی رەشۆکی کرد لە ئەنجا مدانی رێورەسمی نەورۆز و پێشکەشکردنی دیاری[2]، بە مەش زانیاریەکی بچووك بەڵام بەنرخی بەدەستەوە داوە کە بۆ ئێمە گەلێك گرنگە.

وەك روونە لە کوردستانیش، پیرۆزبایی و دیاری بەخشین نەریتێکی کۆن و چەسپیوی نەورۆز بوو، بەڵام مخابن بەڵگەی وا شکنابەین ئەم پرسە پشتڕاست بکات، ئەوەندە هەیە دەستەی نوسەرانی گۆڤاری ژین، لە ژمارە(١٤)ی گۆڤارەکەدا، کە رۆژی ٢٠-٣-١٩١٩ دەرچووە، بە بۆنەی سەرساڵی کوردییەوە نامەی پیرۆزباییان ئاڕاستەی گەلی کورد کردووە و ئاوا تەخواز بوونە لە یەزدانی مەزن نیشتمان سەرفراز بێت، لە ژمارە(٣)ی گۆڤاری (دیاریی کوردستان)یش کە رۆژی٢٨-٣-١٩٢٥

---

(١) منظومە تأریخ هکاری (بە شیعر وبە فارسی نوسراوە).

(٢) نوادر المخطوطات، ٣٥/٢.

دەرچووە، هاتووە" نەورۆز لای قەومی کوردیش رۆژێکی مو بارەك و تاریخی یە، خوا ئەم رۆژە لە میللەتی ئێران و کورد موبارەك بکا"(١).

پیرەمێردی نەمریش لە سەرگوتاری رۆژنامەی (ژین)، ژ(٧٣٧) کە رۆژی ٢٨ی مارتی ١٩٤٤ دەرچووە، لە ژێر ناوونیشانی (من و نەورۆز) دەنوسێت:

"منداڵ بووم، لای مەلا حسێنە کوچە ئەمخوێند کە ئەگەیشتینە دەمی بەهار، مامۆستا ئەیگوت بچن نەورۆزانە بێنن. ئێمەیش بەسەر دایکمانا ئەگریاین، سا دلیك و باوکمان هەرچییان لەدەست بهاتایەو هەرچییان لەبارا بولیە، یا (چەرخێ) یا قرانێ حەمەشایی یا پەنابات، ئەیاندایێ. ئەمانهێنا، ئەویش بەشی خۆی لێ هەڵئەگرت، یەکی قەمەرەیێکی ئەدایێ"(٢).

## ٤-٣-نەورۆز و شیعەگەری:

ئیمامی عەلی وەك با سکرا، شیرینیی نەورۆزا نەی وەرگر تووە و فەرموویەتی هەموو رۆژێکمان هەر نەورۆز بێت، دیارە ئەم هەڵوێستەی کاریگەریی قوولی هەبووە لە سەر یادکردنەوەی نەورۆز لەلایەن شیعەوە بە هەموو دەستە و گرووپەکانیانەوە، فاتمیەکان لە مصر بە شێوەیەکی

(١) ژمارە(٣)، رۆژی ٢٨-٣-١٩٢٥، ل١١.

(٢) پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە، ل٥٧.

فەرمی جەژنی نەورۆزیان دەگێڕا و ئاگریان دەکردەوە و ئاویان دەڕژاند و میری نەورۆزییان دادەنا[1]، قەرامیتە کە گروپێکی شیعەی ئیسماعیلین و لە سەدەی ٣ک/٩ز دەرکەوتن، نەورۆزان بەڕۆژوو دەبوون.

سەبارەت بە گرووپەکانی دیی شیعە، عەلەوییەکان یان نوصیریەکانی شام بە شێوەیەکی بەرفراوان یادی ئەم جەژ نەیان دە کردەوە، ئەبو سەعید مەیمونی تە بەرانی (م: ٤٢٦ک/١٠٣٥ز) کە یەکێك بوو لە رێبەران و پێشەواکانی شیعە نوصەیریەکان، لە کتێبی (مجموع الأعیاد) لە پیرۆزی و مەزنیی نەورۆز دەدوێت و بە بۆ نە و جەژنێکی خۆ یانی دەزانێت[2].

لەمەش گرنگتر، لە کتێبەکانی گەورە رێبەرانی شیعەی دوازدە ئیمامی وەك موحسن فەیضی قەزوێنی (م: ١٠٩١ک/١٦٨٠ز) و محە مەد باقری مەجلیسی (م: ١١١١ک/١٧٠٠ز) لە کتێبی ( بحار الأ نوار)، ریوا یەتێك لە زاردە ی ئیمامی مەزنی شیعە جەعفەری صادق(م: ١٥٨ک/٧٧٤ز) دەگێرنەوە کە لە بەرسڤی پرسیاری یەکێك لە لایەنگرانی بە ناوی(معلی بن خنیس) فەرموو یەتی و بەپێی ئەو ئاخافتنەی، رۆژی خولقا ندنی ئادەم و رۆژی هاتنەخوارەوەی جبریل و رۆژی شکاندنی بتەکان بە دەستی پێغەمبەر ئیبراهیم خەلیل و رۆژی شکاندنی بتەکانی مە کە لە لایەن پێغەمبەرەوە و رۆژی لەدایکبوونی ئیمامی عەلی و رۆژی غەدیر و

(١) بڕوانە: الصیاد، النوروز وأثره في الأدب العربي، ص١٢١-١٢٦، رمضان رمضان متولی، عید النوروز عند الفرس وتأثیره في المجتمعات العربیة، ص١٩٩-٢٠١.

(٢) مجموع الأعیاد، ص١٨٧-١٩٣.

دەرکەوتنی ئیمامی غائیب ...و زۆربەی رۆژ و بۆنە تایبەتیەکانی شیعە، هەمووی لە رۆژی نەورۆز روویا نداوە[1]، لێرە بەڕا شکاوی کاریگەریی بزاڤی شعوبیەتی فارس و تەشەییوعی صەفەوی بەسەر خولقاندنی ئەم تەرزە ئاخەفتنانە بەدی دەکرێت[2].

## ٤-٤- نەورۆز بنەمای ساڵنامە و رۆژژمێری:

دانی باجی ملکانە بە خیلافەی ئیسلامی لە وەرزی نەورۆزدا، گرفت و ئاستەنگی بۆ کوێخادێ و ملکداران (الدهاقین)دەهێنا یە کا یەوە و ئەم کێشەیە تا سەردەمی خەلیفە (المعتضد: ٢٧٩- ٢٨٩ك/٨٩٣- ٩٠٢ز) بە چارەسەر نەکراوی مایەوە، خیلافە هەر لە سەرەتاوە لە نەورۆزدا وەك رۆژێکی دیاریکراو و نا سراو لای خەڵکی، باج و خیرا جی لە رەعیەت وەردەگرت، واتا بەر لە پێگەهیشتنی رەنج و بەروبوومی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بە چەند مانگێك، ئەمەش گرفت و کێشەی بۆ موڵکداران و جوتیاران و ئاژەڵداران دەنایەوە، لە سەردەمی ئومەویەوە زیاتر لە جارێك هەوڵدرا ئەم ئاریشەیە چارە سەر بکرێت[3]، دوا تر خەلیفە (المتوکل: ٢٣٢-٢٤٧ك/٨٤٧- ٨٦٢ز) بە جدی کاری بۆ چارە سەری ئەم

---

(١) محمد معین، جشن نوروز، مجله جهان نو، سال اول، شماره اول، (خرداد ١٣٢٥ه.ش)، و بڕوانە: نوروز، به کوشش علی دهباشی، ص٤٩-٥٠، ٦٦٧، جشن های آب، ص٢٤٢-٢٤٤.

(٢) جشن های آب، ص٢٢٢-٢٢٦.

(٣) ابوهلال العسکري، کتاب الأوائل، ص٢٧٠-٢٧٢، البیروني، الآثار الباقیة، ص٢٧٤-٢٧٥.

کۆ شەیە کرد و ئیبراهیمی کوڕی عەباسی صولی(م: ٢٤٣ك/٨٥٨ز) نوسەری خەلیفە، لەمبارەیەوە نامیلکەی (الرسالة الغربية(؟)في تأخير النوروز)ی نوسی، بەڵام ئەوەندەی نەبرد خەلیفە بە سەریدا کوژرا[1].

ئەمجا خەلیفە(المعتضد)دوای کۆبوونەوە و راوێژکردن لەگەڵ شارەزایان و پیاوانی دەوڵەت، بڕیاریدا وەرگرتنی باج و خیراج دوا بخرێت بۆ رۆژی یازدە یان حەڤدەی حوزەیران و ئەم رۆژەش بە (النيروز المعتضدي) ناوزەد کرا[2].

کێشەی ساڵنامە و رۆژژمێری و دانانی رۆژێك بە سەرەتای ساڵ، بەم هەنگاوەی خەلیفە چارەسەر نەکرا و مایەوە تا دەستپێکی سەردەمی سەلجوقی و ساڵی٤٦٧ك/١٠٧٤ز سوڵتان جلال الدين مەلیک شاهی سەلجوقی(٤٦٥- ٤٨٥ك/١٠٧٢- ١٠٩٢ز) کۆ مەڵێك زانا و ئەستێرەناسی شارەزای هێنا و کۆیکردنەوە کە یەکێکیان شاعیر و حەکیمی ناودار عومەری خەییام بوو، تا رۆژی نەورۆز بگەڕێننەوە شوێنی سروشتیی خۆی و جێگیری بکەن تا بکرێتە دەستپێکی رۆژژمێری[3].

ئەوەی لێرە بۆ مێژووی کورد گرنگە، ئەوەیە کە هەر لە دێرزەمانەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆ، لە نێو کۆمەڵگای دێهاتی و کۆچەریی کورد یدا و بەتایبەت لە کاروباری وەرزێری و جوتیاری و مەڕداریدا و بەپێی"

(١) ابن الآبار، أعتاب الكتاب، ١٥١/١.

(٢) الآثار الباقية، ص٥٩- ٦٠، تجارب الأمم، ٤٩٨/٤، الكامل في التأريخ، ٥٥٩/٥- ٥٦٠.

(٣) الكامل في التأريخ، ٢٦٥/٨.

مەرسومیّ قەدیمیّ کوردستانیّ " وەك ئەحمەدی خانی دەڵێت[1]، پشت بە رۆژژمێری نەورۆزی دەبەسترا و لە حیسابکردنی رۆژ و مانگ و وەرزیشدا، رۆژی نەورۆز دەکرایە تەوەر و بنەما و بە سەری ساڵ دادەنرا، لە ساڵنامەکەی رەنجوری (م: ١٢٢٢ك/١٨٠٧ز) ی شاعیریشدا ئاماژە بە نەورۆز دراوە[2]، لە کوردەواریدا کە بە گوتەی پیرەمێرد خێڵێکی رۆژهەڵاتیە" تا ئێستا سەری ساڵی تازە یان نەورۆز و بەهار بووە و باووباپیرمان بەم ئاییەنە کە خوا بە رۆژێ کی مو بارەکی داناوە...بە جەژنیان داناوە"[3].

## ٤-٥- رابوونی ئێرانیەکان و بەرزراگرتنی پلەوپایەی نەورۆز:

لە ناوەڕاستی سەدەی٣ك/٩ز خیلافەتی عەباسی و لەگەڵیدا سەرەوەری و باڵادەستیی عەرەب، بەرەو لاواز بوون و پووکانەوە رۆیشت و عەرەب وەك نەتەوەی باڵا و سەردەستە نەمایەوە، لە بەرانبەریشدا، وردە وردە دەسەڵات کەوتە دەست میللەتانی مەوالی- موسڵمانی ناعەرەب- بەتایبەتی ئێرانیەکان لە ناو ئێرانیەکانیش فارس و دەیلەم- گیلەکی و ژمارەیەك کە سایەتیی فارس پۆستی باڵندیان وەرگرت و پلەوپایەی هەستیاریان گرتەدەست لە وەزارەت و دیوانەکان و دامودەزگاکانی دیکەی خیلافەی عەباسی.

---

(١) مەم و زین، ل٨٥.

(٢) عبدالرقیب یوسف، مەلا عومەری رەنجوری ی شالەبەگی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٠٧)، ئەیلول ١٩٨٥،ل١٧١.

(٣) پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە، ل١٢، ١٦.

دواتر و لە ساڵی ٣٣٤ک/٩٤٦ز بوەیهییەکان کە ماڵباتێکی ئێرانین و لە نە تەوەی دەیلەمن، بە غدای پایتەختیان گرت و دەوڵەتی بوەیهیان دامەزراند و تا ساڵی٤٤٧ک/١٠٥٥ز حوکمیان کرد.

لە ئاکامی ئەم رەوشە سیاسیە نوێیەی خیلافەی عەباسی، کورد و میللەتانی دیی ئێرانی، بەرە بەرە بێداربوو نەوە و دەستیان کرد بە ژیاند نەوەی کە لەپوری دێرینی خۆیان لە دابو نەریتی چ ئاکی و رێورەسمی ئایینی و بوژاند نەوەی فەرهەنگ و روناکبیری و هونەر و لایەن و بوارە کانی دیکەی ژیانی کۆمەڵایەتی، هەر لە ئاکامی ئەم بێداربوونەوەیەدا، کێشە و ململانێ کەوتە نێوان عەرەب و فارسەوە و بزاڤی شعوبیەت سەری هەڵدا.

بەبیرهێنانەوە و زیندووکردنەوەی رۆژە ئاییذیە مێژوویەکانی وەك نەورۆز و میهرەجان و سەدك، یەکێکبوو لەو بوارانەی کە بایەخێکی زۆری پێدرا و کرایە هێمایەکی بەرچاوی خۆدەرهێنان و شانازیکردنی ئێرانیەکان بە شارستانیەت و رابردووی پڕ سەروەریی خۆیان و ئەو رۆژانە وەك ناسنامەیەکی نەتەوەییان لێهات و خەڵکی بە چڕی و بە جۆش و خرۆشەوە ساڵانە یادیان دەکردەوە، بگرە نەورۆز لە قەبارەی دروستی خۆی برایە دەرەوە و گەلێك نیاردەی گەردوونی و سروشتیی وەك ز یادکردن و کەمکردن و هەڵ چوون و دا چوونی رو باری ذیل و بڵاوبوو نەوەی دەرد و پەتا و نەخۆ شی و بەرپابوونی شەڕو شۆڕ و کەوتنەوەی گرانی و قاتوقڕی ... بە شێوەیەك لە شێوەکان پەیوەست

کران بە نەورۆزەوە[1]، بەڵکو هەرچی داهێنان و دەستکەوتی زانستیی مرۆڤایەتی هەیە لە بوارەکانی ژیانی مەدەنیەت و شارستانیەتدا دەدرانە پاڵ جەمشیدی پێشدادی[2].

لەمەیش زیاتر، وا بڵاوبووەوە کە نەورۆز یەکەم رۆژی کات و بوونە و خودا لەو رۆژەدا رو ناکیی خولقا ندووە و خۆر و مانگ و ئە ستێرە هەسارەکانی بزواندووە و گەردوونیش دەستی کردووە بە خولا نەوە و هەر لەو رۆژەشدا، خودا پێغەمبەر هودی بۆ گەلی عاد و صالحی بۆ گەلی (ثمود) ناردووە، ئەمانە و چەندین رووداوی مێژوویی گرنگ و کاریگەر[3].

ساخکردنەوەی یادی نەورۆز لەنێو زۆربەی خەڵکی بە ئێرانی و غەیرە ئێرانیەوە، هەندە برەوی سەند و ئاهەنگگێڕان لەو رۆژەدا هەندە لە جەم چین و توێژەکانی کۆمەڵ بەربڵاوبوو و هاوتەریب رەفتار و کاری لاساری و سەرکێشیی وا ئەنجام دەدرا کە لە گەڵ گیان و جەوهەری ئاینی ئیسلام نەدەگونجا، بۆ نموونە ساڵێکیان نەورۆز کەوتبووە مانگی رەمەزانەوە، کەچی کەسانی وا هەبوون سڵیان نەکردەوە لەوەی تا بەرەبەیان مەی بخۆنەوە[4].

---

(١) الآثار الباقية، ص٢٨٠-٢٨٢، نوادر المخطوطات، ٢/٥٥-٥٦.

(٢) الفردوسي، الشاهنامه، ص٢١-٢٢، حمدالله مستوفى، تأريخ گزيده، ص٧٥. و بڕوانە: نوروز، به كوشش على دهباشى، ص٧٤-٧٥.

(٣) الآثار الباقية، ص٢١٦، ابوهلال العسكري، الأوائل، ص٤١٢، النويري، نهاية الأرب،١/١٧٥، المقريزي، الخطط المقريزية، ٢/٣٣-٣٤. وبڕوانە: القزويني، عجائب المخلوقات، ص٧٧.

(٤) ابوالفرج الاصفهاني، الأغاني، ١٩/٢٤٦، ٢٦٥.

لە ئاست ئەم رەوش و دیاردە یە، خەڵکانی دیندار و پێگیر بە ئیسلامەوە، کاردانەوەیان هەبوو و هەڵوێستیان وەرگرت و بۆ ئەوەی پرشنگی شیرك و کوفریان بەرنەکەوێت و تا بەکردەوە بیسەلمێنن کە ئەوان جیاوازن لەگەڵ کەسانی لادەر و گومڕا و هیچ پابەندییێکیان بەو جەژنەوە نیە، ئەو رۆژە لە ماڵێك یان لە مزگەوت گرددەبوونەوە و بەرۆژوو دە بوون و خۆ یان بە خوێند نەوەی قور ئان و نو ێژکردن و پاڕانەوە خەریك دەکرد[1]، هەروەها (ابن الرُّومي: م٢٨٣ك/٨٩٦ن) ئاماژە بە بەڕۆژووبوونی رۆژی نەورۆز دەکات:

صَبْحَةُ النَّوْرُوزِ فِي الأحدِ .. غَلَّ عنك الصومُ كلَّ يَدِ

فصباح الفطر موعدنا .. بصَبوح كامل العُدَدِ[2].

بەرۆژووبوون لە هەردوو جەژنی نەورۆز و میهرەجا ندا، بووە پرسێکی فیقهی و لە نێوان فەقیە و شەرعزاناندا مشتومڕی لێکەوتەوە و ئەو پرسیارە کەڵاڵەبوو کە ناوبەناو گفتوگۆی لەمەڕ دەکرا، ئایە حەڵاڵە یان حەرامە؟[3].

لە راستیدا زۆربەیان وای بۆدەچن کە رۆژوو گرتن لەو دوو رۆژەدا ناڕەوا و نابەجێیە و بەدەرە لە ئیسلام، بەڵکو بیدعە یەکی مەزنە[4]،

---

(١) ابن وضاح القرطبي، البدع والنهي عنها، ص٤٢، الحكيم الترمذي، نوادر الأصول في أحاديث الرسول، ص١٦٥، البيهقي، شعب الايمان، ٤٢٥/٣، الخطيب البغدادي، تأريخ بغداد، ٤٩٧/٩.

(٢) ديوان ابن الرومي، ص ١٤٢٥.

(٣) "مَا قَالُوا فِي صَوْمِ النَّيْرُوزِ"، مصنف ابن أبي شيبة، ٣٤٣/٢.

(٤) البدع والنهي عنها، ص٤٢.

چونکە پەیوەستە بە میللەتانی عەجەم- ناعەرەب و بە حیسابی عەرەب نەناسراون، ئەنەسی کوڕی ما لك (م: ٩٣ك/٧١٢ز) و حە سەنی بە صری (م: ١١٠ك/٧٢٨ز) بەرۆژووبوون لەو دوو رۆژە یان بەباش نەزانیوە و چونکە تایبەتن بە گەلانی ناعەرەب- عەجەم[١]، لەم بارەیەوە(ابن تیمیة: م٧٢٨ك/١٣٢٨ز) ئەم ئاخافتنەی(ع بدالله بن ع مرو بن ال عاص) دەگێڕێتەوە: ئەو کەسەی چاو لە عەجەمکان بکات و ئەوەی ئەوان لە نەورۆز و میهرەجان دەیکەن بیکات، ئەوا لە رۆژی قیامەتدا لەگەڵیا ندا حەشر دەکرێت[٢].

وەلێ هاوکات زانایانی واش هەبوون بەگە ندیان کردووە و بگرە بە جۆرێك لە خوداپەرستی و خۆبەدوورگرتن لە کار و کردەوەی خراپ و ناشەرعییان داناوە و یەکێك بە ناوی(محمد بن الفخار ا لجذامي) (م:٧٢٣ ك/١٣٢٣ز) لەمبارەوە کتێبی (الفصل المنتضیء المهزوز في الرد علی من أنکر صیام النیروز)ی داناوە و بۆ خۆپارێزی، پە سەندی بەرۆژووبوونی نەورۆزی کردووە[٣].

هەر لەمیا نەی رەتکرد نەوەی نەورۆزدا، نو سەر ئە حمەدی کوڕی حوسێنی هەمەدانی ناودار بە(بدیع الزمان:م٣٩٨ك/١٠٠٨ز) کە هەر چەند بەخۆی ئێرانیە، وەلێ بە لا یەنگرێکی سەرسەختی عەرەب و ئیسلام ناسراوە و دەبێت یادکردنەوەی جەژنەکانی سەدە- سەدك (الـ سدق) و

(١) مصنف ابن أبي شيبة، ٣٤٣/٢.

(٢) الفتاوی الکبری، دار المعرفة،٤٧٨/٢.

(٣) ابن فرحون، الديباج المذهب،٣٠٤/١.

نەورۆز و میهرەگان، تەواو پەست و نیگەرانی کردبێت، بۆیە کاردانەوەی هەبووە و سەرکۆنەی ئەو کەسانە دەکاتە کە لەو سێ جەژنەدا، ئاهەنگ دەگێڕن و ئاگردەکەنەوە و دەڵێت ئەوانە گومڕا و سەرلێشێواون و لەو دنیاش ژووان و دیداریان لەگەڵ ئاگر دەبێت(١).

## ٤ـ٦ـ تۆمارکردنی مێژووی نەورۆز:

بوارێکی دی کەی بایە خدان بە نەورۆز لە سەردەمی را بوونی ئێرانیەکان، بریتی بوو لەوەی کە بە هەموو رێگایەك کار بۆ تۆمارکردنی مێژووی جەژنەکانی نەورۆز و میهرەگان و بۆنە میللیەکانی دی بکرێت، ئەوەبوو چەندین کتێب و نامیلکە سەبارەت بە مێژوو و بنەڕەتی نەورۆز نوو سران تا با یەخ و پیرۆزی و سوودی دەربخرێت، وە لێ مخابن سەرلەبەری ئەم کتێب ونامیلکانە فەوتاون:

ـ زادویە بن شاهویە (سەدەی٣ك/٩ز)، کتاب علة أعیاد الفرس(٢).

ـ علي بن مهدي الکسروي (سەدەی٣ك/٩ز)، کتاب الأعیاد والنواریز.

ـ علي بن هارون المنجم (م: ٣٥٢ك/٩٦٣ز)، کتاب النوروز والمهرجان(٣).

ـ حمزة الأصفهاني (م: ٣٦٠ك/٩٧١ز)، رسالة الأشعار السائرة في النیروز والمهرجان(٤).

---

(١) الثعالبي، یتیمة الدهر، ٣٠٤/٤.

(٢) الآثار الباقیة، ص٧٨، ٢٧٣.

(٣) ابن الندیم، الفهرست، ص١٧٨.

(٤) الآثار الباقیة، ص٥٩، ٨٩.

**ـ علي بن حمزة الأصفهاني (م: ٣٧٥ك/٩٨٥ز)، كتاب أعياد الفرس[1].**

**ـ الصاحب إسماعيل بن عباد (م: ٣٨٥ك/٩٩٥ز)، كتاب الأعياد وفضائل النيروز[2].**

**ـ نصر بن عامر بن وهب السنجاري، كتاب ما روي في يوم النيروز[3].**

---

(١) النويري، نهاية الأرب، ١/١٧٥. وبڕوانە: الزركلي، الأعلام، ٤/٢٨٣.

(٢) الفهرست، ص١٩٤.

(٣) النجاشي، الرجال، ص٤٢٨.

## ٥ـ١ـ نەورۆز لە یادەوەریی کورد دا:

نەورۆز وەك بۆنەیەکی سروشتی و جڤاکی، بە پتەوی و رەگداکوتاوی لە کۆمەڵگای کوردی مایەوە، وێڕای ئەوەی کۆمەڵگاکە لە هەموو روویەکەوە بووە ئیسلامی و رێورەسم و پرەنسیپ و دابونەریتی ئایینی ئیسلام گشت بوارەکانی ژیانی تەنییەوە و هەژموونی تەواوی خۆی سەپاند، کەچی نەبووە مایەی ئەوەی ناوی پرشنگداری نەورۆز لەبەین بچێت و ئەم رۆژە پیرۆزە لە یاد و خەیاڵدانی تاکی کورد رەش ببێتەوە، هەرچەند بنەما ئایینی و ئەفسانەییەکانی کاڵبوونەوە و تەنها وەك یادگارییەکی دڵخۆشکەری باب و باپیران خۆی پاراست، دووریش نیە توێژی دینداران درێغیان نەکردبێت لە رەتکردنەوەی یادکرنەوەی نەورۆز و دانانی بە بیدعە و گومڕابوون، لە دەمێکدا دەیان بۆنە و جەژن و دابونەریتی جڤاکیی دی بە یەکجاری بنەبڕکران و شوێنەوارێکی ولیان نەمایەوە.

بێگومان نەورۆز لە دێرەمانەوە، لە لای کوردی سەرجەم ناوچەکانی کورد ستان بە رەوە ند و دێ هاتی و شارنشینەوە، رۆژێ کی نا سراو و لەبیرنەکراو بوو و کوردی وا هەبوو ناوی نەورۆزی لە منداڵی دەنا[1] یان مێژووی رووداویان پێ دیاری دەکرد[1]، لەمبارەیەوە شاعیر حارسی

(١) دفتر تحرير مُفصل وإجمال ولاية أربيل لسنة ٩٤٩هـ/١٥٤٢م، ترجمة د.خليل علي مراد (أربيل:٢٠١٥)، ص٥٩. و بڕوانە : ئۆگست ژابا (١٨٠١ـ١٨٩٤)، فەرهەنگی کوردی- فەڕەنسی، فێردیناند یۆستی ساڵی ١٨٧٩بڵاوی کردۆتەوە، وەرگێڕانی پێشەکی د.نەجاتی عەبدوڵا، ئەکادیمیای کوردی (هەولێر: ٢٠١٠)، ل٤٦١.

بەدلیسی دەڵێت تۆ رۆژی تەواو پاش نەورۆز- ساڵی ١٧٥٩ز- لە دانانی چیرۆکی (لەیلا و مەجنون) بوومەوە:

ئەم رۆژ تەمام پاشی نەورۆز
مەنقووش من کر بگێن پیرۆز[٢].

هەروەها میللەتی کورد دەیزانی کە "رۆژێکە خودا ئەم جیهانەی تێیا دروست کردووە...و ساڵ ئەگەڕێتەوە و سەرلەنوێ زەوی زیندوو ئەبێتەوە، درەخت و گیا ئەبووژێتەوە، هەوایێکی تازە ئەکەوێتە ناوەوە. ئینسان کە هەناسە هەڵدەکێشێ، تێ دەگا کەوا گیانی تازە ئەبێتەوە"[٣]، مەڕداران و جوتیارانیش وەك پەند و قسەی نەستەق دەیانگوت "نەورۆز عەجیب رۆز- رۆژ"[٤].

لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوەش، راپەڕینەکەی کاوەی ئاسنگەر و زاڵبوونی بەسەر زوحاکی خوێنڕێژ و ستەمکاردا، لەپاڵ داستانی مەم و زینی خانی دا، وەك هێمای سەرکەوتن و جەژنی رزگاری و سەرفرازی، لە لایەن روناکبیرانی کورد و رێبەرانی بزافی ئازادیخوازیی کوردەوە خرانەگەڕ، بۆ هاندانی گەل و بزواندنی هەستی نەتەوایەتیی

(١) منظومە تأریخ هکاری(بە شیعر و بە فارسی نوسراوە)، محەمەد عەلی قەرەداغی ، بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگای دەستخەتەکانیانەوە ،٦/٢٥١.

(٢) لەیلا و مەجنوون، بەرهەفکرن: تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، دەزگای سپیرێز (دهۆک: ٢٠٠٤)، ل٤٢.

(٣) پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە، ل٥٨.

(٤) گۆڤاری ژین، ژمارە(٧)، ئیستەنبول:٢ی کانون ثانی١٣٢٥هـ، ل٧.

لاوانی خوێنگەرمی کورد و جۆشدانی خەبات لە پێناو سەرخۆبوون[1] و شێخ سەعیدی پیران و سەرکردەکانی شۆڕشەکەی ساڵی ١٩٢٥ یش بە تەما بوون ڕۆژی نەورۆز بکەنە دەستپێکی بەرپاکردنی شۆڕش و بەرخودان. وەلێ گرفت و ئاستەنگ لەوەدایە کە دەنگو باس و زانیاری دەربارەی ڕێوڕەسمەکانی نەورۆزی کوردستان یەکجارکەمە و سەرچاوەکان شتێکی وەها یان تێدا نیە و لەمڕووەوە هەتا ڕێژەی دەستکورتین و زۆربەی هەواڵ و زانیاریەکان تایبەتن بە شارە ئاپۆرە و ئاوەدانەکانی وەك بەغدا[2] و موصل[3] و ئەصبەهان[4].

مخابن میر شەرەفخانی بەدلیسی و مەلا مەحمودی بایەزیدی و مێژوونوسانی دیکەی کورد، خۆیان لە باسکردنی نەورۆزی کوردەواری بواردووە، شاعیرانی کوردیش نەورۆزیان تەنها وەك ڕۆژێکی پڕ خۆشی و شادی داناوە و ساتی دەرکەوتنی دلبەریان بە نەورۆز چوواندووە و ئێمە ناتوانین زانیارییێکی ئەوتۆ لە شیعرەکانیان بەدەست بخەین، بۆیە ئەو هەواڵانەی وا لەبەردەست دان زۆر کورتن و سەرپێیین و تەنها بە شی ئەوە دەکەن کە بڵێین ڕۆژی نەورۆز بەردەوام بەها و پیرۆزیی خۆی پاراستووە. پیرەمێرد لە ژمارە(٥٦٠)ی ڕۆژنامەی (ژین) کە ڕۆژی (٣ی

(١) جوردي غورغاس، الحركة الكردية التركية في المنفى، ترجمة:جورج البطل، ص٢١١_٢١٣.

(٢) نشوار المحاضرة، ٢٩٣/١_٢٩٤.

(٣) الكامل في التأريخ، ٦٨٦/٥، نهاية الأرب، ٢٤٠/٢٢.

(٤) بڕوانە: ابن حوقل، صورة الأرض، ص٣١٠، الآثار الباقية، ص٢٩٠.

مارتی۱۹۳۹) دەر چووە، لە ژێر ناوونیشانی "نەورۆزی ئێمە چییە؟" دەنوسێت:

" ئەوەتی من هەم و گوێم رووا و بەڵکوو ئەوەتی سلێمانی دانراوە، بەهاران کە وتیان نەورۆزە، یەعنی سەری ساڵی تازەیە، ئێمە سەیرانمان کردووە، نەورۆزانەمان بۆ نووسراوە و ئەوەتیش ئەم شاری سلێمانی یە هەیە، موناسەبەتێکمان لەگەڵ ئێران دا نەبوە، بە فارسی هەر"کوردی پدەرسوختە" بووین، وەك تورك پێیان ئەوتین "أكراد بدنهاد".

پار، بە ئیجتیهاد و ئیجادی مودیر شورطەی پێشوو، سوونی مەعنایێك خرایە ناوەوە، مەنعی نەورۆز کرا"[1].

لە کاتێکدا خەلیفە و شاهان و میران و رایەداران، ڕۆژی نەورۆزیان دەقۆستەوە بۆ گیرفان پڕکردن و وەرگرتنی نایابترین دیاری، مەوالی یە ئێرانیەکان، بە ئاهەنگگێران و سازدانی کۆڕی دیلان و گۆرانی، خۆشی و ئاسودەیی خۆیان دەردەبڕی.

دەکرێت بڵێین لە جەژنی نەورۆزدا ئەم چالاکیانە ئەنجام دەدران:

- ئاگرکردنەوە لە ئێوارەی نەورۆز.
- رووکردنە دەشتودەر بۆ گەشت و سەیران.
- گێڕانی شایی و دیلان.
- رێکخستنی چالاکیی رۆشنبیری و پێشبڕکێ.

(۱) پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە، ل۱۵.

## ٥-٢- ئاگرکردنەوە و ئاو پژاندن:

وەك ئاشکرایە ئاگرکردنەوە لە دێوارەی رۆژی بەر لە نەورۆز، تا رۆژگاری ئەمرۆش زەقترین و دیارترین جەژنی و نیشانەی راگەیاندنی نەورۆزی کوردستانە، لە ئاڤێستاش دا ئاگر بەها و پایەی خۆی هەیە و لە توخمەکانی دی: خاك و ئاو و هەوا گرنگترە[1]، ئەم نەریتە تا دێت و ساڵ بە ساڵ بەرفراوانتر دەبێت و لە هەموو ئاوەدانییەك و لە ئاوەرەیی و لە هەر جێگاییێك کوردی لێ هەبێت، هەر چۆنێك بێت لە شوێنێکی بڵند ئاگر دەکرێتەوە و بە هێمای سەرکەوتن و سەرفرازی و دەربڕی دڵخۆشی و شادمانی دادەنرێت.

لەگەڵ سەرهەڵدان و گەشەسەندنی بزاڤی رزگاریخوازیی کوردیشدا، روخسار و ناوەڕۆکێکی تەواو نەتەوەیی وەرگرت و بووە جێگای فەخر و شانازی و سمبولێکی هەرەدیاری ناسنامەی کوردایەتی.

لەم ساڵانەی دواییشدا، قالبێکی فەرمی وەرگرتووە و حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ئاستێکی باڵا و لە شوێنێکی تەرخانکراودا، ئەم ئاگرە دەکاتەوە و چەند رۆژێکیشی کردووەتە پشوو.

سەبارەت بە سەردەمانی ئیسلامی و سەدەکانی ناوەڕاست، لە سەر چاوە مێژوو یەکان و لە دیوانی شاعیراندا، بەڵگە گەلێك هەن دەی سەلمێنن کە هەر لەمێژە لە دەمەو دێوارەی نەورۆزدا، ئاگر کراوەتەوە و موژدە و مزگێنیی بڕانەوەی سەرماوسۆڵە و هاتنی بەهار راگەهێندراوە کە لایەنی کەم دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ٣ك/٩ز، هاوکات

(١) رەزا دەشتی، نەورۆز و بۆنەکان، ل١٣٢-١٣٣.

لەگەڵ رابوونی ئێرانیەکان، بەڵام گرفت لەوە دایە کە سەرچاوەکان ـ وەك ئاماژەی پێدرا ـ تەنها لە ئاگرکردنەوەی شارە گەورەکانی وەك بەغدا و قاهیرە دەدوێن[1].

لە ساڵی ٢٨٤ك/٨٩٧ز و بە دوو رۆژ بەر لە نەورۆز، خەلیفە(المعتضد)، لە پەیامێکدا کردنەوەی ئاگری نەورۆز و ئاو رژاندنی لە بازارەکان قەدەغەکرد، بەڵام لە ئەنجامی پێداگیری و فشاری خەڵکی، هەر زوو لەم بریارە پاشگەز بووەوە و بۆ رۆژی دوایی، واتا رۆژێك بەر لە نەورۆز و ئێوارەی ئەو رۆژەی کە ئاگرەکە دەکرێتەوە، رێگادرا ئاگر بکرێتەوە و ئاهەنگ بگێردرێت و خەڵکییش بەم کارە رابوون[2].

هەروەها نەورۆزی ساڵی ٣٢٨ك/٩٤٠ز دەکەوتە رۆژی دووهەمی مانگی رەمەزانەوە[3]، خەڵکی لە ترسی ئەوەی نەبادا دەسەڵاتداران ئەهێڵن لە رۆژانی رەمەزان دا ئاگر بکرێتەوە، پێشوەخت ئاگریان کردەوە و ئاویان رژاند، سەرەتا چینی تایبەت(الخاصة) و ئەوجا چینی گشتی[4] و لە ئاخافتنی قازیی تەننوخی(م: ٣٨٤ك/٩٩٤ن) دەردەکەوێت کە وا لە بەغدا بە شێوەیەکی بەرچاو نەورۆزان ئاگر دەکرایەوە و مۆم و چرا پێدەکران و پارەیەکی زۆر خەرج دەکرا[5].

---

(١) الخطط المقريزية، ٢/٣٥.

(٢) تأريخ الطبري، ١٠/٥٣.

(٣) رۆژی دووهەمی رەمەزانی ساڵی ٣٢٨ك بەرانبەر رۆژی ١١ـ ٦ـ ٩٤٠زاییینیە و ئەم رۆژە نەورۆزە وەك باسکرا بە (النوروز المعتضدي) دەناسرا.

(٤) الصولي، أخبار الراضي، ص١٤٢.

(٥) نشوار المحاضرة، ١/٢٩٣ـ٢٩٤.

هەروەها ئاگری نەورۆزی شارۆچکەی کلوازای خۆرهەڵاتی بە غداش بەناوبانگ بوو[1]، جاری واش هەبوو ئاگرکردنەوەکە ئاژاوەی بەدوودا دەهات[2].

دوای لەناو چوونی خیلافەی عەباسی، پێزانین دەر بارەی ئاگری نەورۆز کەم دەبێتەوە، هەروەها پاسکردن و یادی ئەم ئاگرە لە بەر هەمی شاعیران وەك پێشوو نامێنێت، هەر چەند بەڵگەکان و ئاماژەکان باسی ئەوە هەن کە بێژین جەژنی نەورۆز لەو سەردەمانەش و لەلایەن هەموو دەوڵەت و میرنشینەکانەوە هەر زیندووبووە و یاد کراوەتەوە[3].

ئاو پرژاندن برگەیەکی دیکەی بنەرەتیی جەژنی نەورۆز بوو کە بۆ بەیانیی شەوی نەورۆز ئەنجام دەدرا و ئاهەنگگێڕەکان ئاویان بە سەر خۆیان و هاتو چۆکەران و شورتەی دەوڵە تدا دە کرد و جارێک یان زمانەوانی ناسراو(ابو القاسم الزجاجي: م٣٣٧ك/٩٤٨ز) بەرکەوت.

دەربارەی بنەچە و پاساوی ئاو پرژاندن، لە راستیدا بەرسفێکی وا نیە جێگای قەناعەت بێت و رەنگە لەبەر ئەوەی رێورەسمێکی کۆنە و زادەی سەردەمی ئەفسانەییە، هۆکارە راستەقینەکەی بە نەزانراوی بمێنێتەوە، مێژوونوسان هەر لەخۆیا ئەوە لێکدانەوەیان بۆکردووە و بۆچوونی جیاوازیان دەربڕیوە، دەڵێن خەڵکە کە بە هۆی ئاگرە کەوە

(١) البیروني، الآثار الباقیة، ص٢٧٠.

(٢) مسکویە، تجارب الأمم، ٢٨٨/٦.

(٣)جشن های آب، ص٢٥٢، الصیاد، النوروز وأثره، ص٥٧_٦٥.

دووکەڵ و ڕەژوویان لێ ئاڵاوە و ئەم ئاو پرژاند نە وەك خۆشو شتن و خۆخاوێنکردنەوە بووە، یان وەك ڕێوڕەسمێکی ئایینی بووە تا باران بیارێت، سەرەڕای گەڕاندنەوەی بۆ چەند ڕووداوێکی ئەفسانەیی[1].

لە لایەکی دیکەوە، لە شیعری چەند شاعیرێکدا، دەردە کەوێت کە ئاگرکرد نەوە و ئاو پرژا ندن، دوو مەرجی سەرەکی و دوو نیشانەی تایبەتی نەورۆز بوون و هەر دە بوو ئەنجام بدرێن، شاعیرێك بە ناوی(المعوج)دەڵێت:

كَيْفَ إبتهاجَك بالنيروز يا سَكني؟

................ وكُل ما فيه يحكيني وأحكيهِ!

فَناره كَلهيب النار في كَبَدي!...

................ وماؤه كتوالي دَمْعَتي فيهِ!

شاعیرێکی دی دەڵێت:

نَوْرَزَ الناس ونَوْرَزْ... تُ، لكن بِدموعي!

وذَكَت نارهم، والنا...ر ما بَين ضلوعي!

یەکێکی دی دەڵێت:

ولَما أتى النوروز يا غاية المُنى

................ وأنتَ على الأعراض والهَجر والصَدِّ

بَعَثتُ بنارِ الشوق ليلاً إلى الحشا

................ فَنَورزتُ صُبحا بالدموعِ على الخدِّ[1].

---

(١) الجاحظ، المحاسن والأضداد، ص٢٧٩، ابوهلال العسكري، الأوائل، ص٤١٢، البيروني، الآثار الباقية، ص٢٧٤-٢٧٥.

سەبارەت بە ئاگری نەورۆزی کوردستان، نە لە مەم وزینی خانی و نە لە شیعری شاعیران و نە لە دە قە مێژووییەکا ندا، بەڵگە یەکمان دەست ئەکەوت بە راشکاوی باس لەم رێورە سمە بکات، دیارە پاش سەدەی ٥ك/١١ز و کۆتاهاتنی سەروەری و باڵادە ستیی ئێرانی یەکان لە فارس و دەیلەم و کورد و هاتنی تورکە سەلجوقیەکان، رێورەسمی ئاگرکردنەوە بەرەبەرە کەمبۆتەوە و بەرەو برانەوە چووە، ئەوە ندە هەیە مەلای جەزیری (م:١٦٤٠ز)، ئاگری دووتوێی دڵ و سینەی بە ئاگری نەورۆز چوواندووە:

ئەڤ نار و سیقالا دله دائیم ل وی قالا دله

نەورۆز و سەرسالا دله وەقتێ هلێتن ئەو سیراج[٢].

هەروەها شاعیرێکی موصڵی بە ناوی ئەبویەعقوب ئیسحاقی کوڕی مەروان (م: ٦٣٤ك/١٢٣٦ز)[٣] لە ئاگری کوردان دەدوێت و روون نیە ئایا ئەم ئاگرکردنەوەیەیان وەك نەریتێکی تایبەت و پەیوەندیدار بە جەژنی نەورۆزەوە بووە و لە چوارچێوەی پیرۆز راگرتنی ئاگرەوە بووە؟ یان تەنها لە بەر سەرماو سۆلە و بۆ خۆگەرمکرد نەوە و روناککرد نەوە کردوویانەتەوە، شاعیر شیعرەکەی تایبەت بە(نار الأکراد) داناوە، بەڵام تەنها ئەم دوو بەیتەی تۆمارکراوە:

---

(١) النویری، نهایة الأرب، ١/١٧٦-١٧٧، الخطط المقریزیة، ٢/٣٧.

(٢) دیوانا مەلایێ جزیری، ل١١٢.

(٣) ئەم شاعیرە لە گەمارۆ گەورەکەی هەولێر ساڵی٦٣٤ك/١٢٣٦ز بە دەستی مەغۆل کوژرا.

قد كانت النار أذا أوقدت ... في الليل لِتُرتاح إليها النفوسِ

فاليوم قد صارا يراها الفت ى فينثني عَنها بوجهٍ عَبوس[1].

لە دوو بەیتە شیعری دیدا، زیاتر لەوە دڵنیا مان دەکاتەوە کە ئاگرەکە تایبەت بووە بە کوردان و لە دەربەندەکانا کرنوویانەتەوە و خەڵکییان چەواشەکردوە کە گوایە لە ترساندا دەیکەنەوە، بەڵام وەک شاعیر دەڵێت وەک ئەوەی بڵێی کەس ئاگای لە کوردان نییە و ترس لەوەدایە کە درۆ بکەن و ئەو رووداوەش سەیرە کە راستیەکەی ئافاتە بۆ کۆچەری و شارنشینەکان:

كم أوقد الأكراد في الدربند نارهم ... من خوفهم كذنيا من غير ما خبر

والخوف أن يكذبوا فأعجب لحادثة ... في صدقها آفة للبدو والحضر[2].

ئاگری نەورۆز پاش نزیکەی هەزار ساڵ خامۆشی، پیرەمێردی شاعیر لە سییەکانی سەدەی رابردوو هەڵی کردەوە و رێورەسمێکی بنەڕەتی و دێرینی نەورۆزی هێنایەوە یادمان، ئەوەش"بە یادی گیانی پاکی باوک و باپیر[3]" و زیندووکردنەوەی" عەنعەنە و پیشەیێکی باووباپیرمان"[4].

لێرە پێویستە ئەوەش بڵێین کە چە شتە کە سانێك، هەرگیز هەڵوێستیان باش نەبووە و میانڕەیش نەبووە لە ئاست هەر بۆنە و

---

(١) ابن الشعار، قلائد الجمان، ٢/٣٦٥.

(٢) قلائد الجمان،١/٣٦٥ . ئەم بڕگانەم لەکتێبێکی خۆم (کۆمەڵگای کوردەواری لە سەدەکانی ناوەڕاست، ل٣٠٤-٣٠٥) وەرگرتووە.

(٣) رۆژنامەی ژیان، ژمارە(٤٣٣)، ٢ی ئازاری ١٩٣٥، ل٤. بڕوانە: پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە، ل١٨.

(٤) پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە، ل٣٥، ٥٨.

د یاردە و رەفتارێکی کۆمەڵایەتی، ئەگەر تەواو لەگەڵ جەوهەر و پرنسیپەکانی ئایین یەک نەگرێتەوە، چ جای ئەو بۆنانەی وا بۆنی مەجوسیەت و ئاگرپەرستییان لێبێت و گومانی لادان و لەرێگا دەرچوونیان لێبکرێت، رەنگە ئەم هەڵوێستەیان هۆکارێکی سەرەکیی بنەبڕکردنی ئاگرکردنەوە بووبێت لە کوردستان.

ئێمە هەرچەند لەمبارەیەوە بەڵگەیەکی وامان لەبەردەست دا نیە، بەڵام ئەگەر ئاگاداری ئەوە بین کە لە سەردەمی نوێ و لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا، بە گوتەی پیرەمێردی نەمرکە سانێکی "بێ ناموس و زۆڵی بەروو" چییان پێ کرد و بە سیخوڕ و پیاوی ئینگلیز و ئاگرپەرست تاوانباریان کرد[1]، دەبێت بپرسین ئەدی لە سەردەمانی پێشوتردا چۆن سەرەدەرییان لە ئاست ئەم پرسەدا کردبێت؟.

پیرەمێرد لەمیانەی هاتنەدەنگ و بەرپەرچدانەوەی ئەو تەرزە کەسانەدا، لە ژمارە(٥٦٠)ی رۆژنامەی(ژین)دا، کە رۆژی(٢ی مارتی ١٩٣٩) دەرچووە، دەنوسێت :" با دین و ئایینی ئاتەشپەرستیش لە پێشدا بووبێ، تووخوا ئێستا دەورێکی وایە ئینسان ئاگر بپەرستێ!! ئاگرێک کە من خۆم بیکەمەوە و بیکوژێنمەوە و بمسووتێنێ و زەرەرم لێ بدا، چۆن ئەیپەرستم. ئەوانە کەرن کە نیسبەتی ئاتەشپەرستی بە ئێمە ئەدەن"[2].

(١) پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە، ل٩٧.

(٢) پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە، ل١٦.

هەروەها لە ژمارە(٧٣٧)دا کە ڕۆژی (٢٨ی مارتی ١٩٤٤) دەرچووە، دەنوسێت:" وەی تۆ ئاگری نەورۆز ئەکەیتەوە، ئاگرپەرستی! کوڕە باوکم موسڵمانم، ئاگرێك کە خۆم ئەیکەمەوە و ئەیکوژێنمەوە، چۆنی ئەپەرستم؟! خێر، دەستەی ... چوونە لای موتەصەڕیفی ئەوسایە کە "مەجید یەعقووبی" بوو، شکاتیان کرد، چەرمەسەرییێکی زۆریان داین و قوتابیی زانستی حەپس کران و غەزەتەکەیان داخستم، کەس نەیئەوێرا بێ بەلاما. موبارەکێکی تری خۆیشمان، پار نەیدەهێشت نەورۆز بکەم. شکاتم لای" لاین"[1] کرد، ئەویش بۆی نووسیبوو: بۆچی مەنعی ئەکەی؟ وتبووی حکوومەت ئیسعافی ئایینی ئاتەشپەرستی ناکا، ئەو جوابەم لەلایە. تا لە بەغداوە وتیان: دیموقراطی ئەم نەوعە قصە قۆڕانە قبووڵ ناکا"[2].

## ٥ـ٣ـ ڕووکردنە دەشتودەر بۆ گەشت و سەیران:

دەر چوون لە شار و بازێڕە کان و ڕووکرد نە دە شتودەر و بۆ ناو سروشت، پاش ئاگرکردنەوە دیاترین ڕێوڕسمی نەورۆزانەیە، دەربارەی ئەم بابەتەش، لە سەرچاوەکان تەنها ئەوەندە دەزا نین کە میر(مەهد الدولة) سەعیدی کوڕی مەروان(٣٨٧ـ ٤٠١ك/٩٩٧ـ ١٠١٠ز) ساڵانە بەهاران

---

(١) کاپتن لاین (١٨٩٢ـ١٩٧٧)، لە بنەماڵەیەکی سکۆتلەندییە، ساڵی ١٩١٨ هاتووەتە میزۆپۆتامیا و بەشداریی داگیرکردنی موصڵی کردووە، لە ساڵانی ١٩٢٠ـ ١٩٢٢ هاریکاری حاکمی سیاسی و لە ساڵانی ١٩٢٥ـ١٩٢٩ موفەتیشی ئیداریی سلێمانی بووە. پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە، ل٥٩(پەراوێز).

(٢) پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە، ل٥٩ـ٦٠ وبڕوانە: ل٩٥، ٩٧.

بە داروودەستە و سترانبێژانەوە رووی دەکردە قەڵای هەتاخ و دە بووە میوانی شێرۆی کوڕی مەم وماوەیەکیان بە خواردنەوە و بەزموڕەزم و راووشکارەوە بەسەردەبرد[1].

دەرچوونی بەهاران لە سەردەمی عوسمانیش هەر بەردەوامبوو، لێرەش تەنها دەقێکی تاقانە شکدەبەین، ئەیش ئەوە یە کە خەڵکی شاری زاخۆ بەهاران تێکڕا گەورە و بچووك روویان دەکرە دەشتودەر و ماڵەکانیان چۆل دەکرد، ساڵێکیان کابرایەکی جولەکە چۆلبوونی ماڵ و بازاڕی شاری بە فرسەت زانی و چەندی پێ کرا دە ستی نەپاراست لە تاڵانکردن[2].

بەڵام ئەوەی جێگای خۆشبەختیە، ئەمر ئە حمەدی خانی(١٦٥١-١٧٠٧ز) لە مەم و زیندا، باربۆی ئەم ناتەواو یەی کردۆتەوە و پەردەی لەسەر برێك نهێنی هەڵماڵیوە و پێزانینی گرنگ و پرسوودی بەدەستەوە داوە و نەورۆزی بە "مەرسومێ قەدیمێ کوردستانێ" و " مەوسمێ سرور و شادمانی" و "عیدێ وصال" داناوە و لەمانەش هەموو گرنگتر نەورۆزی بە "عادەتێ موبارەك" ژماردووە[3]، کە دەبوو خەڵکی گەشت و سەیران بکەن: بەدەرکەتنا شەهریانە ب دەشتێ

ژ بۆ سەیرانا سەرساڵ و گەشتێ[4].

---

(١) الفارقي، تأريخ الفارقي، ص٨٨.

(٢) ياسين العمري، غاية المرام، ص١٤٢.

(٣) مەم و زین، ل ٨٥.

(٤) مەم و زین، ل٩١.

هەرچەند نەورۆزی کوردستان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، بنەما و پیرۆزییە ئایینیەکانی لەدەستدا و زیاتر مۆرك و ڕوخساری دابونەریتێکی کۆمەڵایەتی وەر گرت، بەڵام لە مەم وزینەدا تێدە گەین کە چوونە دەرەوەی شارنشینان لە نەورۆزدا بۆ پشوودان و هەوا گۆڕین و رابواردن و بەسەربردنی دەمێك بە هێمنی و ئارامی، وەك تەقس و ڕێوڕەسمێکی ئایینی لێهات و دەبوو گەنج و پیر، ژن و پیاو، منداڵ و مەزن، میر و کرمانج وەك ئەرکێکی سەرشانیان جێبەجێی بکەن، لە سۆنگەی ئەمەوە خۆیان دەڕازاندەوە و بەهاترین جلوبەرگ و پۆشاکیان دەپۆشی و بە سواری و بە پیادە، بڕ بڕیان تاك تاك دەردەکەوتن و ڕوویان دە کردە پاوەند و مێرگوزارەکان تا ئەو رادە یەی بازێڕ و قەڵا و ماڵەکان لە ئاوەدانی چۆڵ دە بوون، بە واتا یەکی دی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵ بە جل و پۆشاکی رەنگاوڕەنگ و ئاڵاوواڵاوە لە سەیرانگاکاندا ئامادەدەبوون بۆ دەربڕینی دڵخۆشی و ئاسوودەیی خۆ یان و بۆ نوێکردنەوەی سوز و پەیمان لەگەڵ نەورۆزدا، ئەوەندە بە گەرموگوڕی و جوش و خروشەوە ئاهەنگیان دەگێڕا وەك بێژی ڕێوڕەسمێکی ئایینی بەجێ دەگەهێنن و ئەرکێکی پێویستی سەرشانیان ئەنجام دەدەن کە نەدەکرا سازشی لەسەر بکرێت و چاوی لێ بپۆشرێت، ئەم دیاردەیەش لە دێر زەمانەوە هەر هەبووە و پێرەمێرد و باب و باپیران گێڕاویانەتەوە:

هندەک ژ تەحەڕوکا طەبیعی
ئەو تێنە ب نوقطەیا رەبیعی
تەجدید دکن ژ بۆ مە سالێ
گافا وەکوو تێنە ئیعتدالێ
دانایێ موعەممەرێ کوهەن سال

ئەڤ رەنگەهە گۆ ژ بۆ مە ئەحوال
کو عادەتێ پێشییێ زەمانان
ئەڤ بوو ل هەمی جە و مەکانان
وەقتێ وەکوو شەهسوارێ خاوەر
تەحویل دکر د ماهێ ئازەر
یەعنێ کو دهاتە بورجێ سەرسال
قەط کەس نەدما د مەسکەن ومال
(بالجملة) دەچوونە دەر ژ مالان
حەتتا دگەهیشتە پیر و کالان
رۆژا کو دبیت عیدێ نەوروز
تەعظیم ژ بوو دەما دل ئەفروز
صەحرا و چەمەن دکرنە مەسکەن
بەیدا و دەمەن دکرنە گولشەن
خاسما عەزەب و کچێ د باکر
(القصة) جەواهرێ د نادر
تێکدا د موزەییەن و مولەببەس
ڤێکرا ل تەفەرووجێ مورەخخەص[1].

بە دەرکەتنا شەهریانە ب گەشتێ
ژ بۆ سەیرانا سەرسال و گەشتی
دەورا فەلەکێ ژ بەختێ فەیرۆز
دیسان کو نوما ژ نووڤە نەورۆز
مەبنی ل وی عادەتی موبارەك
شەهری وسوپاهیان ب جارەك
باژێر و کەلات و خانی بەردان
تەشبیهی ب نژدەیان و جەردان

(١) مەم و زین، ل٨٧ـ٨٩.

صەف صەف دمەشینە کووە و دەشتان
رەف رەف دخشینە سەیر و گەشتان
ئەصنافێ ئومەم صیغار و کوببار
قەطعا ڤەنەما د شەهری دەییار
هندەک ب پەیایی چوونە باغان
هندەک ب سواری چوونە راغان
هندەک ب تەبایی و ب کثرەت
هندەک ب هەڤالی و ب وەحدەت[1].

**گەشت و گۆڤەندی نەورۆز لە لایەکی دیەوە، هەلی گونجاو و دەلیڤەی لەباری دەرەخساند بۆ کچان و کورانی ئەڤیندار و تا مەزرۆی ژووان، تا خۆیان برازێننەوە و بە یەکدی بگەن و رازی پەنگخواردووی دڵیان بۆ یەکدی هەڵبرێژن و تا دڵداری و یێڵ و سەرگەردان بە دیداری دلبەرەکەی شاد ببێت و پەیمانی خۆشەویستی نوێ بکەنەوە، تەنانەت دڵدار و دلبەری وا هەبوون، تەنها بە هیوا و مەبەستی چاوپێکەوتن، نەورۆزان دەچوونە دەرەوە، بۆ ئا کە نەورۆز بەخۆی "عیدێ وصال" بێت[2]:**

لەورا کو ئەوان غەرەض ژ گەشتێ
مەقصوود ژ چوویینا ب دەشتێ
ئەو بوو کو چ طالب و چ مەطلووب
یەعنی دو طەرەف موحب و مەحبووب
ئەڤ هەردو جەلەب کو هەڤ ببینن

(1) مەم وزین، ل٩١.

(2) مەم وزین، ل٨٥.

کوفئێ د خوە ئەو ژ بۆ خوە بینن[1].

.................................................

رابوونەڤە خانم و خەواتین
وان ژی تژی گول کرن بەساتین
حووران کرە مەسکەنێ خوە جەننەت
بێ پەردە و بێ مەلال و مننەت
ئەتراب و کەواعبێ د عەذرا
موردان و موراهقێ د زیبا
وان لێك دکرن مەتاعێ یێک عەرض
تەخمین دکرن ب(طول والعرض)
سەوداگەر عشقێ بوون د بازاڕ
هەم بائعێ حوسنێ هەم خرێدار[2].

هەر لە سەرویەندی رۆژێکی نەورۆز بوو، مەم و زین چاوویان بەیەك کەوت و یەکدییان خۆشویست و شەیدای یەکدی بوون و داستانی نەمری مەم وزینی لێ لەدایکبوو، کە من لە لێکۆڵینەوەیکدا گەهیشتوومەتە ئەو قەناعەتەی کە لە سەدەی ٥ك/ ١١ز و سەردەمی دەوڵەتی دۆستەکی-مەروانی بووە[3].

لەو باوەڕە دام کە بەزموڕەزم و گە شتوگوزاری نەورۆزان، پتر تایبەت بوو بە دە سەڵاتداران و چینی دەوڵەمە ند و دەستڕۆیشتوو و دانیشتووانی شارەکان، دەنا کوردی رەوەند و نیوچە رەوەند و لادێیی،

(١) مەم وزین، ل٨٩.

(٢) مەم وزین، ل٩١-٩٢.

(٣ ) بڕوانە کتێبی: لە بارەی مێژوو و کەلتووری کوردییەوە، دەزگای جەمال عیرفان (سلێمانی: ٢٠٢١)، ل١٤-٤٦.

لە بەر چڕوپڕیی فرمان و ئیشوکاری ئەبڕاوەی سەر شانیان، دە می ئەوەیان نەبوو سەری خۆیان بخورێنن، کەنگی دەپەڕژانە سەر ئەوەی یادی نەورۆز بکەنەوە و ئاهەنگ بگێڕن، لای ئەوان تەنها چەمکە ئابوری و سروشتیەکەی نەورۆز گرنگ و مەبەست بوو کە ما نای خۆشبوونی کەش و گۆڕانی ئاووهەوا و بڕانەوەی سڕوسارديی زستانی دەگەیا ند، دواتریش سازدان و رێکخستنی کاروباری خۆیان لە وەرزی نوێدا.

لەوە دەچێت دەرچوون و گەشت و سەیرانی نەورۆزانیش وەك رێورەسمەکانی دی، بەرەبەرە کز بووبێت و برەو و گەرموگوڕیی جارانی نەمابێت و تەنها نەورۆز وەك رۆژێکی خۆش و ناسراوی ساڵ و بناغە و مەکۆی دانانی رۆژمێری مایەوە و دەستەڵاتداران کردبیانە دەلیڤەیەك بۆ وەرگرتنی دیاری گرانبەها و شرینی کە تا کوتاهی سەدەی نوزدە و سەردەمی قاچاری و عوسمانی هەر مابوو[1].

## ٥-٤- گێڕانی شایی و دیلان:

وێڕای ئاگرکردنەوە و ئاو پرژاندن و رووکردنە سروشت و سەیران، سازدانی گۆڤەند و شایی و هەڵپەڕکێ و گێڕا نی کۆڕی ستران چڕین لە گەڵ بەکارهێنانی ئامێری مۆزیکی، بڕگە یەکی دیکەی نەڕەتیی جەژنی نەورۆز بوو، جێگای داخە زانیاریمان لەسەر ئەم بابەتە گرنگەش یەکجار کە مە و ئەوەی هە شە بە رێک کەوت هاتووە، دەگێڕ نەوە

(١) بڕوانە: النوروز وأثره في الأدب العربي، ص٥١-٦٤، جشن های آب، ص ٢٧٦-٣١٠.

جارێکیان صۆفیی ناودار ئەبومەنصوری حەللاج (م:٣٠٩ك/٩٢٢ز) بە نزیك شاری نەهاوەندی کورنشیندا تێدەپەڕێت و گوێی لە دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا دەبێت و لە یاوەرێکی دەپرسێت ئەوە چییە؟ ئەویش پێی گوتووە ئەوە نەورۆزە و خەڵکی ئاهەنگ دەگێڕن[1].

ئەوەش بڵێین کە یەکێك لە ئاوازە ناسراو و دێرینەکانی ئێرانییەکان ناوی (نەورۆز) بوو و لەو سەرچاوە مۆزیکیەکاندا ناوی ئەم ئاوازە براوە، سترانێکی تایبەتیش بە نەورۆز هەبووە و دەنگێك ـ ئاوازێك هەبوو کە بە بۆنەی نەورۆزەوە دەکرا یە گۆرانی[2]، دەبێت ئەم ئاوازە لە کوردستانیش ناسراو بوو بێت و کرابێتە ستران، تەنانەت مۆزیکزانی کورد عومەری کوڕی خدری داسەنی (م:٧٥٨ك/١٣٥٧ز) شارەزایی لێهەبوو[3].

ئەم ئاوازە نەورۆزیەش چەند جۆریکی هەبوو وەك نەورۆزی رەسەن و نەورۆزی حیجازی و نەورۆزی عەجەم و نەورۆزی عەرەب و بەیاتی بچووك و گەورە[4].

رەنگە شایی و بووك گواستنەوەش لە کوردستاندا پتر لە رۆژانی نەورۆزدا ئەنجام درابێت، گەڕیدەی ئینگلیزی کلۆد یۆس جیمس ریچ(١٧٨٧ـ١٨٢١) لە درێژەی گەشتەکەیدا بۆ کوردستان، رۆژی (٢١)ی ئازاری ١٨٢٠ دەگاتە ئاواهییێکی نزیك قزلریاتـ سەعدیە و بۆ شەوەکەی

---

(١) ابن الساعي الخازن، أخبار الحلاج، ص٤٥ـ٤٦.

(٢) ابو الفرج الأصفهاني، الأغاني، ٧٥/٩.

(٣) العمري، مسالك الأبصار، ٤٠٠/١٠.

(٤) جشن هاى ئاب، ص١٠٥.

ئامادەی زەماوەندی بووک گواستنەوەیەک دەبێت و دەبیذیت چۆن خەڵکەکە شیربازی دەکەن و بە دەوری سۆپا و چراوە سەما دەکەن [1] و کاتێک چووە بۆ سنەی بارەگای میرانی ئەردەڵان، دەڵێت کوڕێکی خانی ئەردەڵان، کچی شاهی قاجاری مارەکردووە و بەتەمایە رۆژی نەورۆزی داهاتوو بیگوازێتەوە [2].

هەر لەم چوار چێوەیەدا، شوێنەوارناس هینری فرانکفۆرت(١٨٩٧-١٩٥٤)دەگێڕێتەوە کە دەمێک لە بەهاری ساڵی ١٩٣٠ سەرقاڵی کنە و هەڵکۆڵین بووین لە شوێنەوارەکانی خۆرساباد لە باکوری موصڵ، لە شەوی ٢١/٢٠ ئادار واتە شەوی نەورۆز، بە دەنگ و هەرای گۆرانی و چەپڵەڕێزان و سەمای ئێهاتیەکان بەئاگا هاتینەوە و دوا تر زانیمان دووانیان هەر کرێکاری خۆمان بوون، ئەمجا بە درێژی باسی سەما و ستران و رێورەسمی بۆنەکەی کردووە کە زیاتر بۆ باران بارین بووە کە کوردانی باجەلان لە گوندی فازلییە ئەنجامیان دەدا [3].

---

(١) رحلة ريچ، ص٣٧٤.

(٢) رحلة ريچ، ص٢٣٤.

(٣) سرووتێکی (تەمموز) لە کوردستاندا، وەرگێڕانی د.ئازاد حەمە شەریف، گۆڤاری رامان، ژمارە(٢٠٤)، ل١١٦-١٢٣.

## ٥ـ٥ـ ڕێکخستنی چالاکیی ڕۆشنبیری و پێشبڕکێ:

هەر لە نەورۆزدا، چالاکیی ئەدەبی و رۆشنبیری سازدەدرا و هەر ناوچەیەك بە شێوازی تایبەتیی خۆی، شادمانی و ئاسودەیی خۆی دەردەبڕی، گەڕۆکی عوسمانی ئەولیا چەلەبی لە گەشتەکەیدا ـ ساڵی ١٦٥٦زـ دەگاتە ئامێدی و دەڵێت: ئامێدییەکان گەلێك شیعری پێنج بەیتی و پێنج خشتەکی و شەش خشتەکی و حەفت خشتەکی و هەشت خشتەکییان بە کوردی داناوە و بە بۆنەی نەورۆزەوە، مەزن و بچووك و خوێندەوار و نەخوێندەوار لەسەر ڕێگاکان گردەبنەوە و ئەو شیعرانە بەیەکدیدا دەڵێن و بۆ یەکدی دەیسەننەوە(١).

پیرەمێردیش لە رۆژنامەی (ژین)، ژ(٧٢٧) کە رۆژی (٢٨ی مارتی١٩٤٤) دەرچووە، دەگێڕێتەوە کە بە مندالی لە سلێمانی لە رۆژانی نەورۆزدا، دەچوونە مزگەوتی شێخ ئەورەحمانی شێخ ئەبوبەکر، ئەوجا عەبدولاسورەی تۆلەتوویی بە خەتێکی خۆش، نەورۆزنامەی بۆ دەنوسینەوە:

نوروز شد، نوروز شد    نوروز نو فیروز شد

دنیا همه پیروز شد ..... بلبل غزل آموز شد

بابا بده نوروزیم        تا برخوری از روزیم

---

(٢)Evliya çelebı Sıyahatnamesi, s. 309.

"ئیتر ئەمە بە هەموو کۆلان و سەربانێکدا، بە گۆرانییەوە ئەمانگوت. ئەو ڕۆژەیش ئازاد بووین، ئەچووینە ئەو دەشتە، ئیتر نەمانئەزانی ئەم ڕۆژە چییە"(١).

بڕگەیەکی دیکەی ئاهەنگی نەورۆز، ڕێکخستنی پێشبڕکێ و گەمەی میللی بوو، هەرچەند پێزانینمان دەربارەی ئەم لایەنەش کەمە، خەڵکی بەغدا لە شەوانی نەورۆزدا بوکەڵەیەکیان دروست دە کرد بە بارستایی منداڵێك و جلی جوانیان دەکردە بەری و بەخشڵ و زێڕ دەیانڕازاندەوە و لە سەربانان دە یانگێڕا و گە مەیان پ ێدەکرد و بەدەمەیەوە دە هۆڵ و زوڕنایان لێدەدا و ئاگریان دەکردەوە، ئەم یارییە ناوی(دووبارەکە) بوو کە پەیڤێکی عەجەمیە واتا عەرەبی ن یە، لەمبارە یەوە ژنە شاعیرێك دەڵێت:

شاورني الْكَرْخِي لما دنا الني... روز وَالسّن لَهُ ضاحكه

فَقَالَ مَا نهدي لسلطاننا ... من خير مَا الْكَفُ لَهُ مَالكه

قلت لَهُ كل الْهَدَايَا سوى ... مشورتي ضائعة هالكه

أهد لَهُ نَفسك حَتَّى إِذا ... أشعل نَارا كنت دوباركه(٢).

هەروەها کات بەسەربردن بە جۆلا نەکردن، گەمە یەکی د یی باوی نەورۆزان بوو لای ئێرانیەکان، لەمبارەیەوە کابرایەکی دیندار بە ناوی

، نزار ئەیوب گولی، ژ کەفنترین هۆزانڤانێ بەهدینان مەلا رەمەزانێ عەباسی، کۆڤارا دیرۆك، ژمارە(١٢)، ل٣٦ـ٤١.

(١) پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە، ل٥٧ـ٥٨.

(٢) التنوخي، نشوار المحاضرة، ١/١١٠، الصفدي، الوافي بالوفيات، ٣١٤/١٦.

(طلحة بن مصرف الكوفي: م١١٢ك/٧٣١ز) دەیگوت حەزدە کەم رۆژی نەورۆز بگوزەرێت و من هەستی پێ نەکەم و پێم ناخۆشە مرۆڤێك ببینم لەسەر جۆلانە یاری دەکات[1].

دوور نیە ئەم دوو گەمەیە و هی دییش لە رۆژانی نەورۆزی کوردستاندا سازدرابێ، بۆ نموونە دانیشتوانی شاری وان، نەورۆزان هەڵدەستان چی گامێش وئەسپی جسن و هوشتر و بەرانیان هەیە لە هۆڵ و تەوێلەکانیان دەردەهێنا و دەیاندان بەشەڕەوە و دەمێکی خۆشیان بە تەما شاکردن دەگوزەراند[2].

لە راستیدا لە یادکرد نەوەی جەژنی نەورۆزدا، جگە لەوا نەی باسکران، رێوڕەسمی دی هەبوون وەك: چوارشەممە سورە و حەفت سین و میری نەورۆزی...هتد، بەڵام هیچ زانیارییێك یان لە سەر دە ست ناکەوێت.

سەبارەت بە چوارشەممە سورە، لە هەواڵێکدا هاتووە کە میران و سەرانی کورد چوارشەممەیان بە رۆژی ئاشتی و پشوودان دادەنا و ئامادە نەبوون بچنە شەڕ و کوشتار[3]، گومان لەوەدا نیە کە ئەم نەریتەش پەیوەندیی راستەوخۆی بە چوارشەممە سورەی نەورۆزەوە هەیە.

---

(١) الحكيم الترمذي، نوادر الأصول في أحاديث الرسول، ص١٥٨، ١٦٥، البيهقي، شعب الإيمان، ٢٤٤/٥. پێغەمبەر(ص) نەهی لە سواربوونی جۆلانە کردووە، چونکە بەهۆیەوە عەورەی مرۆڤ بە تایبەت هی ژنان دەردەکەوێت.

(٢) رحلة أوليا جلبي في كوردستان، ص٢٤٨.

(٣) البدليسي، شرفنامه، ص٢٣٩.

## ٥-٦- ئەیوبییەکان و یادکردنەوەی نەورۆز:

یادکردنەوە و ئاهەنگگێڕان بە نەورۆز و پیرۆزیی ئەم رۆژە لای ئەیوبییەکان فەرامۆش نەکراوە کە وەك ئاشکرایە بەخۆیان کوردن و ئێرانین، بەلام بەو پێیەی ئەوان لە رۆژگاری شەڕی خاچهەلگرەکاندا، دەسەلاتداریتی بەشێکی گرنگی جیهانی ئیسلامی و رێبەرایەتیی شەڕی پیرۆزی جیهادیان دەکرد و لە ململانێدا بوون دەگەل جیهانی رۆژئاوای مەسیحی و کێشەی ئایینی و سیاسی و شارستانی لەئارادا بوو، بۆیە ناکرێت لە شەڕی پیرۆزی جیهاد بیت و هاودەم یادی جەژن و بۆنەگەلێکی نائیسلامی، بگرە نەگونجاو لەگەل پرادسیپەکانی ئیسلام بکەیتەوە، بۆیە دەگمەن دەنگوباسی نەورۆز لە مێژووی ئەیوبی بەرچاو دەکەوێت و ئەوان پتر کاریان بۆ ئەوە دەکرد مەزهەبی سونی لە مصر و شام بلاوبکرێتەوە و سەرقالی وەدەرنانی خاچهەلگرەکان بوون لە قودس و کەنارەکانی شام.

لە راستیدا بەلگە و ئاماژە لە سەرچاوەکاندا کەمن سەبارەت بە چۆنیەتی یادکردنەوەی نەورۆز و بیرەوەریی ئەم رۆژە لەکن ئەیوبییەکان، بەلام پاش مردنی سولتان صەلاحەدین لە سالی٥٨٩ك /١١٩٣ز، بۆ جارێکی دی لە مصر جەژنی نەورۆزی قیبتی کرایەوە، قیبتیەکانیش کە ناو و رێورەسمی ئەو جەژنەیان هەر لە ئێرانیەکان وەرگرتووە، دەستیانکرد بە ئاو پرژاندن و مەشروب خواردنەوە و ئاهەنگگێڕان(١).

---

(١) المقريزي، الخطط المقريزية، ٢/٣٦.

لە لایەکی دیکەوە، وا پێدەچێت نەورۆز ڕۆژێکی پیرۆز و موژدەبەخش بووبێت لای بنەماڵەی ئەیوبی، ئەوەبوو دەمێك سوڵتان صەلاحەدین ساڵی٥٦٤ك/١١٦٩ز پۆستی وەزارەتی لە مصر گرتە دەست، ناردی بە شوێن نجم الدین ئەیوبی بابی تا بەخۆی و خاوخێزانەوە لە دیمەشقەوە بهێن بۆ قاهیرە، کەچی نجم الدین ئەیوب ئەم کۆچەی بۆ مصر دواخست تا هاتنی وەرزی نەورۆز[1]، دەبێت خۆدواخستنەکەی نجم الدین ئەیوب لە سۆنگەی ئەوەوە بووبێت کە نەورۆزی بە ڕۆژێکی پەسند و پڕ خێروبێر زانیوە و ویستویەتی لەو ڕۆژەدا بکەوێتەڕێ تا کۆچەکەی بۆ مصر بێ ئاریشە و سەرکەوتوو بێت، هەروەها شاعیر (ابن سناء الملك: م٦٠٨ك/١٢١١ز) لە شیعرێکدا لە ستایشی شاه سیف الدین محەمەد (الملك العادل: م٦١٥ك/١٢١٨ز)ی برای سوڵتان صەلاحەدین، ناوی نەورۆزی هێناوە و دەڵێت:

وشَبّ لهيبُ القَلبِ اذ فاضَ مَدْمَعي

فَنَوْرَزَ طَرفي اذ رأى القَلبُ مُهرجا[2].

## ٥-٧- شاعیرانی کورد و نەورۆز:

زۆرینەی شاعیرانی کورد، هەر لە با با تاهیری هەمەدانیەوە(م: ٤٩٢ك /١٠٩٩ز) تا ئەمڕۆ، خۆشی و دڵڕفێنی نەورۆزیان لەیاد بووە و لەبیریان

(١) ابوشامة، الروضتين في أخبار الدولتين، ٢/ ٩٧.

(٢) عبدالكريم شاهين، عيد النوروز، الأصل التأريخي والأسطورة، ص٢٨.

نەکردوە و بە رۆژێکی پڕ لە جوانی و شادمانی و گوشادییان دا ناوە و بە جوانی و دلگیریی بەهار و سروشتدا هەڵیانداوە[1].

لای شاعیرانی کلاسیکی، مەگەر هاتنی نەورۆز بە قەد پە یدابوونی دلبەر، دڵتەنگی و خەمگینی بڕەوێنێتەوە، لەکن بابا تاهیری هەمەدانی خۆشیی دیداری یار هاوتای خۆشیی جەژنی نەورۆز بووە، کەچی بە لای مەلای جەزیریەوە ـ وەك باسکرا ـ نەورۆز سەرسالی دڵە و دەمێك دلبەر دەردەکەوێت و وەك چرا هە ڵدێت، دڵی ئالودە و داگیرساوی شاعیر دەحەسێتەوە و لە لای دەبێتە جەژنی نەورۆز:

ئەڤ نار و سیقالا دلە    دائیم ل وی قالا دلە

نەورۆز و سەرسالا دلە    وەقتێ هلێتن ئەو سیراج[2].

لە دوای خانی، سالمی صحیبقران (١٨٠٥-١٨٦٩) زیاتر لە شاعیرانی دی، ناوی نەورۆزی هێناوە و بەلای ئەوەوە وەك زۆربەی شاعیران، هێمایە بۆ دڵخۆشی و دەمی بەزم وصەفا و رابواردنە:

صوبحی نەورۆزە، وەختی بەزمی شەراب

"الصبوح، الصبوح، یا أصحاب"

فەصڵی عەیش و نەشاطە، هەی ئامان

" المُدام، المُدام، یا أحباب"

(١) بڕوا نە: کە شکۆڵە شیعرێکی کوردیی گۆرانی، کۆکرد نەوەی شێخ عەبدولموئمینی مەردۆخی، بڵکەی ژین (سلێمانی: ٢٠١٠)، ل١٦٢، ١٦٥، ١٧٥-١٧٦، ٣٧٤.

(٢) دیوانا مەلایێ جزیری، ل١١٢.

ئەی حەریف، هەفتەیێکە ئابی بەهار

"راح چون لعل آتشین درياب"[1].

لە دوو شیعری دیدا دەڵێت:

بە رەنگ سالم چ سەهلە صوبحی نەورۆز گەر بە یەڵدا بێ

بەبێ رووبی جیهان ئەفرۆزی یاری نازەنینی من[2].

نەسیمی بادی نەورۆزی شەمیمی عەنبەری(؟) هێنا

بەریدی عاشقان دیسا پەیامی دولبەری هێنا[3].

و بە بۆنەی گەڕانەوەی عەبدوڵا پاشای بابانەوە بۆ بەغدا، دەڵێت:

سەختگیریی کرد، ئەگەر سەرما، وەکوو ئەفراسیاب

یادی نەورۆزی بە میثلی پووری دەستان هاتەوە.

باغە پەژموردەی خەزان و خورەمی ئەوقاتی حووت

ماهی نەورۆزی بە عەکسی ماهی ئابان هاتەوە[4].

حاجی قادری کۆییش دەڵێت:

رۆژتە ئەی بادی نەورۆزی لەبن بەفری گران

کانی پێی سڕبوو، چناریش دەستی چوو پەنجەی تەزی[5]. ئەمەو

دەیان شیعر و پەخشانی دی[6].

---

(١) دیوانی سالم، بنکەی ژین، ل١٤٧ـ١٤٨.

(٢) دیوانی سالم، ل٥٧٢.

(٣) دیوانی سالم، ل٨٣٠.

(٤) دیوانی سالم، ل٨٣٠ـ٨٣١.

(٥) دیوانی حاجی قادر، ل١٦٤.

## سەرچاوەكان

### یەكەم: سەرچاوە عەرەبیە بنەڕەتیەكان:

- ابن الأبار، محمد بن عبد الله البلنسي(ت: ٦٥٨هـ/١٢٦٠م).
- إعتاب الكتاب، مطبوعات مجمع اللغة العربية(دمشق:١٩٦١).
- ابن الأثير، عزالدين علي بن محمد الجزري(ت: ٦٣٠هـ/١٢٣٢م).
- الكامل في التأريخ، دار المعرفة(بيروت:٢٠٠٧).
- أبو داود، سليمان بن الأشعث السجستاني(ت: ٢٧٥هـ/٨٨٩م).
- سنن أبي داود، دار الكتاب العربي( بيروت:؟).
- ابن أبي شيبة، عبدالله بن محمد بن إبراهيم(ت: ٢٣٥هـ/٨٥٠م).
- المصنف في الأحاديث والآثار، مكتبة الرشد(الرياض:١٤٠٩هـ).
- الأرشيف العثماني، دفتر تحرير مُفصل وإجمال ولاية أربيل لسنة ٩٤٩هـ/١٥٤٢م، ترجمة د.خليل علي مراد(أربيل:٢٠١٥).
- الأصفهاني، أبوالفرج علي بن الحسين(ت: ٣٥٦هـ/٩٦٧م).
- كتاب الأغاني، دار الفكر (بيروت:١٩٨٦).
- البدليسي، شرفخان بن شمس الدين(ت: ١٠١٠هـ/١٦٠١م).
- شرفنامه، ترجمة محمد جميل الروزبياني، ط٢(أربيل:٢٠٠١).
- البيروني، ابوالريحان محمد بن أحمد (ت: ٤٤٠هـ/١٠٤٨م).
- الآثار الباقية عن القرون الخالية، دار العراب (دمشق:٢٠١٣).

(١) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: محەمەد عبدالرحمن زەنگەنە، نەورۆز نامە، دار الجاحظ (بەغدا: ١٩٨٥)، حسین عزیز روانندزی، نەورۆز لە شیعری كوردیدا، چاپخانەی الحوادث (بەغدا: ١٩٨٥)، عومەر ئیبراهیم عەزیز، دیاری نەورۆز لە پەخشانی كوردیدا (هەولێر: ١٩٨٩)..

- البيهقي، أبو بكر أحمد بن الحسين (ت: ٤٥٨هـ/١٠٦٥م).
- شعب الإيمان، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٤١٠هـ).
- التنوخي، المحسن بن علي (ت: ٣٨٤هـ/٩٩٤م).
- نشوار المحاضرة وأخبار المذاكرة، دار صادر (بيروت: ١٩٧١).
- الثعالبي، عبد الملك بن محمد النيسابوري (ت: ٤٢٩هـ/١٠٣٨م).
- ثمار القلوب في المضاف والمنسوب، دار المعارف (القاهرة:١٩٨٥).
- يتيمة الدهر في محاسن أهل العصر، دار الكتب العلمية (بيروت:١٩٨٣).
- الجاحظ، عمرو بن بحر بن محبوب الكناني (ت: ٢٥٥هـ/٨٦٩م).
- التاج في أخلاق الملوك، المطبعة الأميرية (القاهرة:١٩١٤).
- المحاسن والأضداد، مكتبة الخانجي (القاهرة: ١٩٩٤م).
- جرير، جرير بن عطية بن حنيفة (ت: ١١٠هـ/٧٢٨م).
- ديوان جرير (الموسوعة الشاملة).
- الجهشياري، ابوعبدالله محمد بن عبدوس (ت: ٣٣١هـ/٩٤٣م).
- الوزراء والكتاب (القاهرة: ١٩٣٨).
- الحكيم الترمذي، محمد بن علي (ت: نحو٣٢٠هـ/٩٣٢م).
- نوادر الأصول في أحاديث الرسول، دار الجيل (بيروت: ١٩٩٢).
- الخطيب البغدادي، ابوبكر أحمد بن علي (ت: ٤٦٣هـ/١٠٧٠م).
- تأريخ بغداد، دار الغرب الإسلامي (بيروت:٢٠٠٢).
- الزمخشري، محمود بن عمر الخوارزمي (ت: ٥٣٨هـ/١١٤٣م).
- الكشاف عن حقائق التنزيل، دار إحياء التراث العربي (بيروت: ؟).
- ابن الساعي الخازن، علي بن أنجب البغدادي (ت: ٦٧٤هـ/١٢٧٥م).
- أخبار الحلاج، منشورات الجمل (كولونيا:١٩٩٩).
- أبو سعيد النقاش، محمد بن علي الأصبهاني (ت: ٤١٤هـ/١٠٢٣م).

– فنون العجائب، تحقيق: طارق الطنطاوي، مكتبة القرآن (القاهرة: ؟).
– ابو شامة، عبدالرحمن بن إسماعيل (ت: ٦٦٥هـ/١٢٦٧م).
– الروضتين في أخبار الدولتين، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٢).
– ابن الشعار، المبارك بن الشعار الموصلي (ت: ٦٥٤هـ/١٢٥٦م).
– قلائد الجمان، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٥).
– الصفدي، صلاح الدين خليل بن أيبك (ت: ٧٦٤هـ/١٣٦٢م).
– الوافي بالوفيات، دار إحياء التراث العربي (بيروت:٢٠٠٠).
– الصولي، ابوبكر محمد بن يحيى بن عبدالله(ت: ٣٣٥هـ/٩٤٧م).
– أخبار الراضي بالله والمتقي الله، دار المسيرة (بيروت: ١٩٧٩).
– أدب الكاتب، تحقيق محمد بهجت الأثري (القاهرة:١٩٤١).
– الطبراني، ابو سعيد ميمون بن القاسم (ت: ٤٢٦هـ/١٠٣٥م).
– مجموع الأعياد، تحقيق:ر.شتروطمان (هامبورغ:١٩٤٣).
– الطبري، ابوجعفر محمد بن جرير (ت: ٣١٠هـ/٩٢٣م).
– تاريخ الطبري، دارالمعارف (القاهرة:١٩٧٩ـ١٩٨٢).
– ابن عساكر، علي بن الحسن بن الدمشقي (ت: ٥٧١هـ/١١٧٦م).
– تاريخ دمشق، دار الفكر (دمشق:١٩٩٥).
– العسكري، أبو هلال الحسن بن عبدالل ه(ت: ٣٩٥هـ/١٠٠٥م).
– كتاب الأوائل، دار البشير(طنطا :١٤٠٨هـ).
– العمري، أحمد بن يحيى بن فضل الله (ت: ٧٤٩هـ/١٣٤٨م).
– التعريف بالمصطلح الشريف، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٨٨).
– مسالك الأبصار، المجمع الثقافي (ابوظبي: ٢٠٠٣).
– العمري، ياسين(ت: بعد١٢٣٢هـ/١٨١٦م).
– غاية المرام في تأريخ بغداد، مط: دار البصري (بغداد: ١٩٦٨).

- الفارقي، أحمد بن يوسف علي (ت: بعد٥٧٧هـ/١١٨١م).
- تأريخ الفارقي، دار الكتاب اللبناني (بـيروت: ١٩٧٤).
- ابن فرحون، إبراهيم بن علي اليعمري (ت: ٧٩٩هـ/١٣٩٧م).
- الديباج المذهب في معرفة أعيان علماء المذهب، تحقيق: د. محمد الأحمدي، دار التراث (القاهرة: بلا).
- الفردوسي، ابوالقاسم (ت: ٤١١هـ/١٠٢٠م).
- الشاهنامه، الترجمة العربية، تحقيق عبدالوهاب عزام (القاهرة:١٩٣٢).
- ابن الفقيه، أحمد بن محمد الهمداني (ت: ٣٤٠هـ/٩٥١م).
- كتاب البلدان، تحقيق: يوسف الهادي، عالم الكتب (بيروت:١٩٩٦).
- القاضي النعمان المغربي (ت: ٣٦٣هـ/٩٧٣م).
- دعائم الإسلام، تحقيق: آصف بن علي، دار المعارف(القاهرة: بلا).
- القرطبي، أحمد بن أحمد الأنصاري (ت:٦٧١هـ/١٢٧٢م).
- الجامع لأحكام القران، دار الكتب المصرية (القاهرة:١٩٦٤).
- القزويني، زكريا بن محمد بن محمود (ت: ٦٨٢هـ/١٢٨٣م).
- آثار البلاد وأخبار العباد، دار صادر (بيروت: بلا).
- ابن قيم الجوزية، محمد بن أيوب الزرعي (ت: ٧٥١هـ/١٣٥٠م).
- أحكام أهل الذمة، دار ابن حزم (بيروت:١٩٩٧).
- المسعودي، علي بن الحسين بن علي (ت: ٣٤٦هـ/٩٥٧م).
- التنبيه والأشراف، مكتبة الخياط (بـيروت: ١٩٦٥).
- مروج الذهب ومعادن الجوهر، دار الأندلس (بـيروت:١٩٨١).
- مسكويه، أحمد بن محمد بن يعقوب (ت: ٤٢١هـ/١٠٣٠م).
- تجارب الأمم تحقيق: أبو القاسم إمامي، سروش (طهران:٢٠٠٠).
- مطراقي زاده، نصوح أفندي السلاحي (ت: بعد٩٥٨هـ/١٥٥١م).

- رحلة مطراقي زاده، الترجمة العربية، المجمع الثقافي(أبوظبي: ٢٠٠٣).
- المقدسي، المطهر بن طاهر (ت: نحو٣٥٥هـ/٩٦٧م).
- البدء والتاريخ، مكتبة الثقافة الدينية (بور سعيد: بلا).
- المقريزي، تقي الدين أحمد بن علي (ت: ٨٤٥هـ/١٤٤١م).
- الخطط المقريزية، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٩٨).
- النجاشي، أحمد بن علي بن أحمد الأسدي (ت: ٤٥٠هـ/١٠٥٨م).
- الرجال (فهرست أسماء مصنفي الشيعة)(بلا).
- ابن النديم، ابو الفرج محمد بن إسحق النديم (ت: ٣٨٣هـ/٩٩٣م).
- كتاب الفهرست، دار المعرفة (بيروت: ١٩٧٨).
- النويري، أحمد بن عبدالوهاب (ت: ٧٣٣هـ/١٣٣٣م).
- نهاية الأرب في فنون الأدب، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٤).
- ابن وضاح القرطبي، محمد بن بزيع المرواني (ت: ٢٨٦هـ/٨٩٩م).
- البدع والنهي عنها، مكتبة ابن تيمية (القاهرة: ١٤١٦هـ).
- ياقوت الحموي، ياقوت بن عبدالله الرومي (ت: ٦٢٦هـ/١٢٢٩م).
- معجم الأدباء، دار الغرب الإسلامي (بيروت:١٩٩٣).
- معجم البلدان، دار احياء التراث العربي (بيروت: بلا).

- دووهەم: سەرچاوە نوێیەکان(بە عەرەبی):
- آرثر كريستنسن، إيران في عهد الساسانيين، ترجمة يحيى الخشاب (القاهرة:١٩٥٧).
- إدزارد د. أ، قاموس الآله والأساطير، ترجمة: محمد وحيد خياطة، دار مكتبة سومر(حلب: ١٩٨٧).

- الكسندر هايدل، سفر التكوين البابلي، ترجمة:سعيد الغانمي، دار الجمل (كولونيا:٢٠٠٧).

- جوردي غورغاس، الحركة الكردية التركية في المنفى، ترجمة:جورج البطل، دار الفارابي (بيروت:٢٠١٣).

- حسين قاسم العزين، الجذور الأسطورية لملحمة نوروز الشعبية، دار الشؤون الثقافية العامة(بغداد:٢٠١٠).

- راجحة خضر النعيمي، الأعياد في بلاد وادى الرافدين، دار صفحات (دمشق:٢٠١١).

- ريج، ك.جيمس، رحلة ريج سنة ١٨٢٠، ترجمة: بهاءالدين نوري، الدار العربية للموسوعات (بيروت:٢٠٠٨).

- رينيه لابات، المعتقدات الدينية في بلاد وادي الرافدين، ترجمة الأب البير أبونا ود.وليد الجادر (بغداد:١٩٨٨).

- ر.س.زيهنير، المجوسية الزرادشتية، ترجمة د.سهيل زكار، دار التكوين( دمشق: بلا).

- صموئيل نوح كريمر، من ألواح سومر، ترجمة طه باقر، دار الوراق للطباعة (لندن:٢٠١٠).

- السومريون، تر جمة ا لدكتور فيـ صل ا لوائلي، وكا لة المطبو عات (الكو يت :١٩٥٧).

- طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، دار الوراق للنشر المحدودة (بيروت:٢٠٠٩).

- عبدالرحمن مزوري، نوروز والأزدهاك والكورد، منشورات الأكاديمية الكردية (اربيل: ٢٠١٣).

– عبدالسلام هارون، نوادر المخطوطات (نشر وتحقيق)، الجزء الثاني، دار الجيل (بيروت:١٩٩١).

– فاضل عبدالواحد علي، سومر أسطورة وملحمة، دار الشؤون الثقافية العامة (بغداد:١٩٩٧).

– كارم محمود، أساطير التوراة الكبرى وتراث الشرق الأدنى القديم، دار الحصاد (دمشق:١٩٩٩).

– كاظم عبد علي، النوروز مظهر من مظاهر التواصل بين العرب والفرس، رسالة ماجستير، الجامعة اليسوعية (بيروت:١٩٧٥).

– محمد أمين رشيد، النوروز في الأدب الفارسي، رسالة ماجستير، كلية الآداب (جامعة عين شمس:١٩٧٦).

– الشيخ معروف النودهي، الأعمال الكاملة، ج٣(بغداد:١٩٨٤).

– نائل حنون، حقيقة السومريين، دار الزمان(دمشق:٢٠٠٧).

– عقائد مابعد الموت، دار الشؤون الثقافية العامة(بغداد:١٩٨٦).

– وصفي حسن، عيد نوروز في الشعر العربي، مطبعة الخاني(دهوك: ٢٠١٢).

**سێیەم:سەرچاوە فارسی وکوردییەکان:**

– ئەحمەدێ خانی (م:١٧٠٧ز).

– مەم وزین، بەرهەڤکرن تەحسین ئیبراهیم دوسکی، دەزگای سپیرێز (دهوك:٢٠٠٨).

– أحمد كسروى، شهرياران گمنام، نگاه(تهران: ١٣٨٥هـ.ش).

– تومرخانی یازجی(م: ١٦٣٤ز)،(منظومه تاريخ هكارى).

– جزیری، مەلا ئەحمەدی کوڕی محەمەد(م:١٠٥٠ك/١٦٤٠ز).

– دیوانا مەلایێ جزیری، بەرهەڤکرن تەحسین ئیبراهیم دوسکی، دەزگای سپیرێز(دهوك:٢٠٠٥).

– حاجی قادری کۆیی، دیوانی حاجی قادری کۆیی(بەغدا:١٩٨٦).

– حارسی بەدلیسی(سەدەی١٨ز)، لەیلا ومەجنوون، بەرهەڤکرن: تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، دەزگای سپیرێز(دهۆك:٢٠٠٤).

– حمدالله مستوفی قزوینی(ت: ٧٥٠هـ/١٣٤٩م).

– تارخ گُزیده، مؤسسه انتشارات أمیر کبیر(تهران:١٣٨١هـ.ش).

– رەزا دەشتی، نەورۆز و بۆنەکان لە گێڕانەوە مێژووییەکاندا، وەرگێڕانی ڕێبوار سەرتیپ زەندی، چاپخانەی زانا (سلێمانی: ٢٠١١).

– د.رەفیق شوانی، نەورۆز سەرەتای شارستانیەت و جەژنی نەتەوایەتی کوردە، ئەکادیمیای کوردی (هەولێر:٢٠١٤).

– سالم، عەبدولڕەحمانی صاحیبقڕان(م:١٨٦٩ز).

– دیوانی سالم، بنکەی ژین(سلێمانی:٢٠١٥).

– سدیق ساڵح، پیرەمێرد چیی لەبارەی نەورۆزەوە نووسیوە (ئامادەکردن) ، بنکەی ژین(سلێمانی:٢٠١٣).

– عبدالرقیب یوسف، مەلا عومەری ڕەنجوری ی شالەبەگی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٠٧)(ئەیلول: ١٩٨٥).

– عەبولعەزیم ڕەزایی، مێژووی نەورۆز و کرۆنۆلۆجیای ئێران، وەرگێڕانی شەریف فەلاح، خانەی موکریانی(هەولێر:٢٠١٢).

– عمر خیام، نوروزنامه، مطبعة روشنائی(طهران:١٩٣٣).

– د.مەولود ئیبراهیم حەسەن، نەورۆزی کورد..لە ئەفسانەوە بۆ جیهانی بوون، دەزگای بەدرخان(هەولێر:٢٠١٢).

– نزار ئەیوب گولی، ژ کەڤنترین هۆزانڤا نێ بە هدینان مەلا رە مەزانێ عەباسی، گۆڤارا ئیرۆك، ژمارە(١٢)(دهۆك:پاییز٢٠١٦).

– نوروز(مجموعە مقالات)، بەکوشش علی دهباشی، نشر أفکار(تهران :١٣٩١هـ.ش).

– هاشم رضی، جشن های آب، نوروز سوابق تاریخی تا أمروز، انتشارات بهجت (تهران:١٣٨٥هـ.ش).

– هنری فرانکفۆرت، سرووتێکی(تەمموز) لە کوردستاندا، وەرگێڕانی: د.ئازاد حەمە شەریف، گ.رامان، ژمارە(٢٠٤)(هەولێر:٥–٥–٢٠١٤).

– گۆڤاری ژین، ژمارە(٧)، ئیستەنبول:٢ی کانون ثانی١٣٢٥هـ.

– چوارەم: سەرچاوە بە تورکی وئینگلیزی:

- Evliya çelebı sıyahatnamesi hazirlayanlar: Seyit Ali Kahraman, Yucel Dağli, (Istanbul :2000), IV Kitap.

- James Morier, Second Journey through Persia,Armenia and Asia Minor (London:1818).

# پاشکۆ

## بەشێك لە سەرگوزشتەی فەرەیدون و زوحاك بەگوێرەی گێڕانەوەیەك،،،،

..وفي أخبار فريدون على رواية الفرس: لما أقبل بالبيوراسف من المغرب نحو المشرق ليسجنه بدنباوند مرّ بكورة إصبهان- وقد طوى أفريدون أياما لم يذق طعاما- فطلب قوما يمسكونه عليه ريثما يتغدى. فجمع الملك عالما من الناس فلم يقدروا على إمساكه، فأدار سلاسله على جبل من جبال إصبهان وأوثقه بأساطين وسكك من حديد قوية. وتوثق منه حتى ظن أنه قد أحكم ما أراد. حتى إذا جلس على غذائه، اجتذب البيوراسف سلاسله مع تلك الأساطين والسكك واحتمل الجبل يجره بسحره ثم طار به في الهواء، فتبعه أفريدون فما لحقه إلّا بالمدينة المعروفة ببزورند وهي الري. فلما لحقه قمعه بمقمعة من حديد كانت في يده فسقط مغشيا عليه ورسا ذلك الجبل المنقول من إصبهان بمدينة الري. فهو الآن جبلها المطلّ عليها. فلعن أفريدون ذلك الجبل ودعا الله أن لا ينبت عليه شيئا في شتاء ولا صيف وأن لا يثبت عليه ثلج ولا تسرح عليه سارحة تؤمّه ولا أهلية ولا يأتي إليه حيوان فأجاب الله دعاءه، فهو كذلك إلى يوم التناد.

...ومضى أفريدون- بعد أن حبسه في الكهف واستوثق منه- منصرفا إلى دار مملكته ووكل أرمائيل بحفظ البيوراسف وطعامه. فكان يذبح له في كل يوم رجلين فيغذي بأدمغتهما حيّتيه اللتين على كتفيه أعواما.

ثم إن أرمائيل تحوّب من ذبح الناس فتلطّف في استنقاذهم واحتساب الأجر في إطلاقهم من القتل، فمضى إلى قرية من قرى دنباوند تسمى مندان فبنى

على جبلها أبنية جليلة وقصورا عظيمة وجعل فيها بساتين وعيونا تجري في صحون تلك الدور والبساتين، وبنى في بعض تلك القصور بيتا بخشب الساج والابنوس وصور فيه جميع الصور، فلم يكن لأحد في ناحية المشرق، بناء أشرف منه ارتفاعا وحسنا ودقة نقوش وكثرة عمل وتزاويق وتصاوير وتماثيل.

....وكان أرمائيل نازلا في قصوره وأبنيته التي بناها فإذا جاءوه بالأسارى من الآفاق ليذبحهم ويأخذ أدمغتهم فيغذي الحيتين، أعتق في كل يوم أسيرا وذبح مكانه كبشا وخلط دماغه بدماغ المقتول وغذا به الحيتين أعواما كثيرة. ثم بدا له في الذبح فكان إذا جاءوه بالأسارى أعتقهم وأسكنهم الجبل الغربي من قرية ميندان فبقي على ذلك من حاله ثلاثين عاما يعتق في كل عام سبعمائة وثلاثين إنسانا...

فلما كان بعد ثلاثين حولا من مملكة أفريذون أنفذ إلى أرمائيل رسولا يأتيه بخبر البيوراسف. فلما وافاه أنزله. أرمائيل معه في قصره. فسأله الرسول عما صنع فأخبره خبر المعتقين من الذبح وإنزاله إياهم الجبل الغربي. ولمّا أمسى أمر المعتقين أن يوقد كل واحد منهم على باب الموضع الذي هو فيه نارا ففعلوا. فقال الرسول: ما هذا؟ قال: هؤلاء المعتقون من الذبح. فقال الرسول بالفارسية: وسمانا كي ته آزاد كردي؟ أي: كم من أهل بيت قد أعتقتهم؟ وتناهى الخبر إلى أفريدون فسرّ به سرورا شديدا ومضى نحو جبل دنباوند فوقف عليه فلما تقرر عند فعل أرمائيل شرفه ورفع درجته وسماه المصمغان وأقطعه مدينة دنباوند برساتيقها وقراها وعقد له تاجا وأقعده على سرير ذهب...وكان أفريذون سجن البيوراسف في النصف من ماه مهر وروز مهر، فلما أصبح جعله عيد المهرجان...

كان الضحاك أشد الناس غيرة، فركب يوما إلى الصيد فجاء أفريذون في خيله فدخل داره واحتوى عليه وعلى نسائه. وبلغ ذلك الضحاك فوافى منزله. فلما نظر إلى أفريذون في داره مع نسائه أدركته الغيرة فغشي عليه وسقط عن دابته. ووثب أفريذون فأوثقه ثم تتبع عماله فأخذهم وغلب على ملكه وذلك ماه مهر وروز مهر، فصيره يوم المهرجان. فقالت الأعاجم مهريان لقتل من كان يذبح في كل يوم واتخذوه عيدا. وأخذ المصمغان وقال: إنك كنت شرٌ عماله وكنت صاحب الذبح، فأذبحك كما كنت تذبح الناس. فقال: إن لي بلاء.قال: وما هو؟ قال: كان يأمرني بذبح اثنين في كل يوم فكنت أذبح واحدا وأعتق الآخر. قال: وكيف نعلم صحة ما ذكرت؟ قال: اركب معي حتى أريك إياهم.

فركب معه وسار حتى أشرف على جبال الديلم والشور فنظر إلى عالم قد توالدوا وتناسلوا. فقال: هؤلاء كلهم عتقائي. فقال أفريذون: وس ما ناكي ته آزاد كردي؟.كم من أهل بيت أعتقتهم؟ اذهب فقد ملكتك عليهم. فأعطاه مملكة دنباوند. فلم يزل الضحاك عنده موثقا ستة أشهر ثم قتله يوم النيروز فقالت الأعاجم: أمروز نوروزي اي استقبلنا الدهر بيوم جديد. فاتخذوه عيدا[1].

---

[1] كتاب البلدان، ص٥٥٢_٥٥٤.




پەیدابوونی نەورۆز لە لای کورد بەلای چەمکی دەربازبوون لە چنگ شاهێکی زۆردار شکاوەتەوە وجەخت لەسەر بەدیهاتنی سەربەستی ونازادی وداد پەروەری و نەمانی نەهامەتی و ژێرکەوتن و ئاهەتی وبێدادی کراوەتەوە ، لە نەورۆزی کوردەواریدا سەرکەوتن و رزگاربوون وسەرفرازی ، ئاوێزانی جوانی رەنگێری ونۆژنبوونەوە بوونە و ئاوێتەی یەکدی بوونە و جەژنێکیان بەرهەمهێناوە کە ناوەکەی پڕ بە پێستی خۆیەتی...نەورۆز . لەم کتێبەدا، زیاتر مەبەستە نەورۆز لە هزر وخەیاڵی تاکی کورد پیشان بدەم وە ژیانی واقیعیی جڤاکی کوردەواری بینۆزمەوە و راستیی مێژوویی نەک ئەفسانە بخەمەڕوو. با ئەمیش بێت کە وابزانم هەندێکیان نوێن و پێشتر ئاشکرا نەکراون و دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمانی پاش دەرکەوتنی ئیسلام، تا زیندووکردنەوەی ئاهەنگی نەورۆز لە لایەن پیرەمێردی نەمرەوە.

هەولێر- 2017